ناوی کتێب: مێژووی گۆرانی و مۆسیقای کوردی
نووسینی: فەرهاد پیرباڵ
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٩٤٩
هەڵەگری: تریسکە ئەحمەد
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مەریەم موتەقییان
چاپی یەکەم، هەولێر – ٢٠١٠
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٢٩ی ساڵی ٢٠١٠ی دراوەتێ

# پێڕست

# پێشەکییەک بۆ
# مێژووی گۆرانی و مۆسیقای کوردی

خوا فەرمانی دایە (بنیامین) کە گیان بەبەر ئادەمدا بکا،
بنیامینیش ئاوازی (ڕاست)ی بۆ ڕۆح ژەنی؛
بەم جۆرە ڕۆح چووە جەستەی ئادەمەوە.
*نامەی سەرەنجام: سروودی (یارسان)*

بەئامانجی لێک جوداکردنەوەی ناواخنە ئێستێتیکیەکەی مێژووی مۆسیقای کوردی، من مێژووی مۆسیقا لە کوردستاندا دابەش دەکەمە سەر چەند قۆناغێک:

**قۆناغی یەکەم: سەرەتایی**

ئەو قۆناغە بووە کە مرۆڤی سەرەتایی (لە هەموو یەکەمین لانکەیەکی ژیانی مرۆڤدا) لە سەرەتادا دێت دەنگ و ئاواز دەدۆزێتەوە؛ ئنجا پاشان ئامێرە سەرەتاییەکانی سازدانی دەنگ و ئاواز دروست دەکات. ئەمە یەکەمین شارستانییەتەکانی ئەکەدی و بابلی و ئیلامی و ئاشوورییەکانیش دەگرێتەوە. هەڵبەتا دیارە لە ئەوروپا و لەوانەیە لە هەموو شوێنێکی تریش مرۆڤی لێ هەبووبێ، مۆسیقا هەر ئاوها سەری هەڵدابێ.

تەدارەکی کشتوکاڵ، جەنگ و جەژنەکان، منداڵ نواندن، تا دەگاتە مردووناشتن و شەڕ و شۆڕەکان، کە هەریەکەیان مۆسیقا و گۆرانیی خۆی هەبووە لە ناو هۆزە سەرەتاییەکاندا، ڕۆڵیان هەبووە لە بەستێی نەشونماکردنی مۆسیقادا.

تابلۆ و پەیکەر و شوێنەوارە دێرینەکانی ئەکەدی و بابلی و ئاشوورییەکان پڕن لە گەواهیی ئەوەی کە مرۆڤ لە کوردستانی سەردەمی شارستانییەتە دێرینەکاندا مۆسیقای ناسیوە، ئامێرە سەرەتاییەکانی دەنگ و ئاوازی دروست کردووە. لە سەردەمی سەنحاریب پاشای ئاشوورییەکاندا (٧٠٤-٦٨١ پ. ز) شمشاڵ بەکار هاتووە. لە بەشی یەکەمی کتێبەکەی دانیال پێغەمبەر باسی ئەو ئامێرە مۆسیقاییانە چەندان جار دووپات بووەتەوە کە بابلییەکان بەکاریان هێناون: چەنگ، سەنوور، قانوون. هەروەها لە تەوراتیشدا (١٢٠٠ پ. ز) ناوی ئەو ئامێرانە هاتووە کە ئاشووری و ئیلامی و بابلییەکان کەڵکیان لێ وەرگرتوون: کەرەنای، سوورنای، عوود، بەربەت، سەنتوور، کەمانچە. تەورات (١٢٠٠ پ. ز) ناوی گەلێک لە پێغەمبەرەکانی بردووە کە مۆسیقاژەن و گۆرانیبێژ بوون، لەوانە حەزرەتی داوود و حەزرەتی سلێمان.

ئاشکرایشە مەڵبەندی شارستانییەتیی ئەکەدی و ئاشووری و بابلی و ئیلامییەکان هەمان مەڵبەندەکانی کوردستانن.

گەلێک لە مێژوونووسانی مۆسیقا هەندێ لە ئامێرە مۆسیقاییەکانیش هەر دەگەڕێننەوە بۆ کوردستان، لەم بارەوە شهرزاد قاسم: دراسات في الموسيقي، ل ٩٨، دەڵێ:

«عوود و ساز هەر لە سەردەمی خوورییەکانی دوو هەزار ساڵ پێش مەسیح لە کوردستان لە نێوان شاری (وان) تا دەگاتە ناوچەکانی کوردستانی عێراقی ئەمڕۆ بەکار هاتووە. مێژوونووسەکان بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە ئامێرێکی عوودیان لە ناوچەی (نووزی) دۆزیوەتەوە لە نزیک کەرکووک کە پایتەختی خوورییەکانی بووە ئەو کاتە».

ئەمە جگە لەوەی کە لە ناو تابلۆی دووەمی شەرەفنامە لە سالآنی (١٦٠٠)دا عوود و ساز دەبینین، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە عوود و ساز ئامێرێکی وا بوونە لە کۆنەوە لە کوردستاندا بەکا رهاتوون.

هەڵبەتا من لەم وتارە کرۆنۆلۆجییەدا، نامەوێ بەناو مێژووی دێریندا بچمە ناو باسە ئەنترۆپۆلۆجی و ئەتنۆگرافییەکانی سەردەمی زۆر دێرین، تەنانەت خۆم لە باسی مۆسیقای یەکەمین ئەو شارستانییەتانەش (ئەکەدی و بابلی و ئاشووری..) کە فەرمانڕەوا بوونە لە کوردستان دەپارێزم. بۆیە وەک دواتر دەبینن کرۆنۆلۆجیاکەی خۆمم لە قۆناغی دووەمەوە دەست پێ کردووە.

## قۆناغی دووەم: قۆناغی دین

قۆناغی دین ئەو قۆناغەیە کە مۆسیقا، بەشێوەیەکی گشتی و بەپلەی یەکەم، لە دین و هەستی خواپەرستییەوە سەرچاوەی گرتووە.

ئەم دیاردەیە لە ئەوروپاش هەر بەهەمان شێوەی کوردستان بووە؛ واتە لە ئەوروپاش قۆناغێکی پانوپۆڕی ئەوروپای مەسیحی بەوە تێپەڕ دەبێ کە مۆسیقا لە هەستی خواپەرستی و دینییەوە سەرچاوە وەربگرێت؛ دینی مەسیح سەرچاوەی یەکەم و کانیلەی هەرە گرینگی نەشونمای گۆرانی و مۆسیقا بووە.

لە سەرهەڵدانی مەسیحیەتەوە، بەدرێژاییی سەدەکانی ناوەڕاست، مۆسیقا بەشێک بوو لە مەراسیمەکانی کڵێسای کاتۆلیک: پاشکۆی وشەکانی ناو ئینجیل و جووڵانەوەکانی مەراسیمی کڵێسایی بوو. (تەنانەت مێژوونووس باوەڕیان وایە کە پیانۆ لە ناو کەنیسەدا داهێندراوە). ئاوازە کاتۆلیکییەکان، کە کۆڵەگەی مۆسیقای دینی بوون، لە ماوەی سەدەکانی چوارەم تا نۆیەمدا، لەوپەڕی گەشانەوەی خۆیاندا بوون. تیۆرداڕێژەکانی کڵێسا گەلێک نۆتە و ئاوازی کڵێساییان بۆ کڵێسا کردبوو بە شتێکی ستاندارد. تەنانەت ماوەیەک خەڵک باوەڕی وابوو کە ئاوازی زەنگدانەوەی زەنگی کەنیسە ڕۆحی خراپ دەڕەوێنێتەوە.

کڵێسا بایەخی دەدایە گەشەکردنی مۆسیقا بۆ ئەوەی دین بەباشی بڵاو بکاتەوە و شکۆمەندیی دین و مەسیح و کڵێسا بۆ خەڵک پێشان بدا، بۆیە کڵێسا دەهات گەلێک خەڵکی هەژاری لەسەر جادەکان هەڵدەگرتەوە و فێری

مۆسیقای دەکردن بۆ ئەوەی ببنە گۆیندە و گۆرانیبێژ و «سەلاکێش» و مۆسیقاژەنی کلێسا (وەک مەلافەندی و پیاوە دینییەکانی لای خۆمان کە دەیان دەنگخۆشی وەک شەهابەی هەولێرییان پەروەردە کرد). ئەمەش گەیشتە ئەوەی کە لە ناو کەنیسەکانی ئەوروپادا، مۆسیقای تیۆری، وەک قانوون و فەلسەفە و زانست، ببێتە زانستێکی لاهووتی و بخوێندرێ.

تەنانەت خودی کۆراڵ Chorale کە ئەمڕۆ بە واتایەکی مۆدێرن بەکار دێت، بریتییە لەو سرووده خواپەرستییە پێکەوەیی و میللییانەی کە لە سەرچاوەیەکی دینییەوە هاتوون (ئەو سرووده ئینجیلی و دینییانە بوون کە لە کلێساکانی ئەڵمانیا دەگوترانەوە)؛ مارتن لووتەر Luther (١٤٨٣- ١٥٤٦) گەشەی بە کۆراڵ دا: کۆراڵی دینیی بە گۆرانییە میللییە ئەڵمانییەکان موتوربە کرد.

ئەمە جگە لەوەی کە سەرهەڵدانی خودی نۆتە (واتە ڕێنووسی مۆسیقایی) ئەویش هەر لە ناو ڕاهیبەکانی سەدەکانی یازدەم و دوازدەمدا هاتە کایەوە. ئەمەش وای کرد تێکستی مۆسیقایی بپارێزرێت و پۆلێن بکرێت، کەم و زیاد بکرێت و پەرەی پێ بدرێ.

گوتمان مۆسیقا لە کوردستاندا، بەشێوەیەکی گشتی و بەپلەی یەکەم، لە دین و هەستی مەزهەبییەوە سەرچاوەی گرتووە؟ چۆن؟

لە ڕێگەی کتێبی پیرۆزی (ئاڤێستا)وە کە هاوزەمانی ئیمپراتۆریەتی میدیا (٦٢٥- ٥٥٠ پ. ز) لە هەمەدانەوە بگرە تا دەگاتە ئەولای دیاربەکر بەکوردستاندا بڵاو دەبێتەوە، دینی زەردەشت بە یەکێک لە یەکەمین سەرچاوەکانی گۆرانی و موزیک دەژمێردرێ لە کوردستاندا. مامۆستا حەمەی حەمەباقی و گەلێک نووسەری تریش لە ئێران باسیان لەمە کردووە و من نامەوێ زۆرتری لەسەر بڕۆم، تەنێ ئەوەندە نەبێ کە بڵێم:

گاتا یان گات (گاث/ گاذ) ، کە دەکاتە ئایەتەکانی ناو ئاڤێستا و بەزمانی میدیاکان واتای (گاس) دەگەیەنێ، تا ئەمڕۆش لە دیالێکتی ئەمڕۆی هەولێر و بادینان و مەهاباددا لە شێوەی (گاز) و (گاس)دا ماوەتەوە و بە مانای (بانگ)

دێ: (گـاسـی بکە، گـازی بکە!)؛ لە بـنەڕەتدا برێتـیـیـە لە بانگی زەردەشت بۆ میللەتەکەی خۆی (وەک بانگی پێغەمبەری ئیسلام بۆ قەومەکەی خۆی).

کـەواتە یەسـنا و گـاتاکـان، کـە بە مـوزیک یان لـە شـێـوەی سـروودی دینی دەگوترانەوە، یادگاری ئەو نوێژ و بانگە مـەزهـەبییانەی سـەردەمی زەردەشتن، کـە زۆربەی مـێـژوونووسـان پێـیـان وایە سـیـاچەمـانە و هـۆرەی هەورامـان، هەروەها سـروودی یارسـانـی ئەهلی هەق، بەهەمـان شـێـوە مـوزیک و گۆرانیی یەزیدییەکانیش لە کاتی زیکر و کۆڕەکانیاندا، لە مۆسیقای زەردەشتی و دینی زەردەشتەوە هاتوون.

نیشانەیەکی تری سەلماندنی ئەوەی کە موزیک و گۆرانیی زەمانی زەردەشت تا دەگـاتـە زەمـانـی ئـەهلی هـەق و یەزیدیـیـەکـانیش لـە مـەزهـەب و هـەسـتی دینییەوە سەرچاوەیان گرتووە ئەوەیە کە دەبینـین موزیک و گۆرانی (لە گەلێک شـوێن و حـاڵـەتدا) بەشـێـوەیەکی پێکەوەیی و دەسـتـەجـەمـعی گـوتراون و ژەندراون (هـەمـوویان پێکەوە، وەک کۆڕاڵێک) نەک تاکنەواز و بەتەنیـا لەلایەن تاقە گۆرانیـبـێـژێکەوە وەک ئەمڕۆ دەیبـینین. زۆر لەو وێنانەی لە نیگارکێشە ڕۆژهەڵاتناسەکانی سەدەکانی حەڤدەم تا کۆتاییی سەدەی نۆزدەم بەدەستمان گەیشـتـوون ئەوە نیشـان دەدەن کـە گـۆرانی و مـوزیک (بـەپێـچـەوانەی دۆخی ترۆبادۆرەکـانی ئەوروپا) بە کـۆمـەڵ و دەسـتـەجـەمعی گـوتراون: لـە شـێـوەی تقـووس و ژەنین و چڕیـنێکی پێکـەوەییـدا، وەک ئـەوەی هـەمـوویـان پێکـەوە لە پەرستگایەکدا بن یان پێکەوە نوێژێک بکەن.

هێرۆدۆت بەڵگەیەکی تریش دەهێنێتەوە بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستییە؛ لەبارەی پێشکێشکردنی «قوربانی» لەلایەن میدیاییەکانەوە بۆ خواوەندەکانیان دەڵێ: مووغەکان خۆیان سـەرپەرشتیی ڕێوڕەسـمی ئەم قوربانییانەیان دەکرد. دوای قوربـانیکردنەکـەش، وەک (هـێـرۆدۆت) و (سـتـرابۆن) دەگێـڕنەوە: مـووغـەکان سرووی تایبـەتی خواوەندیان دەچڕی. (هاشـم رضـا: تاریخ مطالعات دینهای ایرانی، چاپ٢، ١٣٧١ش، انتـشـارات بهـجت، تهـران. ص ٢٦ و ٢٨ و ١٠٥- ١٠٦).

پیرۆزبوونی مۆسیقا لای زەردەشتییەکان بە بەڵگەیەکی تریش دەتواندرێ بسەلمێندرێ، ئەویش ئەوەیە کە بەهەشت (بیری بەهەشت) لە دینی زەردەشتدا (بەپێچەوانەی دینی ئیسلام کە تێیدا بەهەشت بریتییە لە حۆری و شەراب و هەنگوین..)؛ بەهەشت لە دینی زەردەشتیدا بریتییە لە مۆسیقا. واتە لە بەهەشتی زەردەشتیدا گۆرانی و موزیک هەیە نەک حۆری و شەراب. ئەمە ئیتر ئەوپەڕی پیرۆزبوون دەبەخشێتە مۆسیقا؛ پێوەندیی نێوان دین و مۆسیقا پیرۆز دەکات.

دوای لەناوچوونی دەوڵەتی میدیا لە ساڵی ٥٥٠ پ. ز، هەخامەنشییەکان (Achemenid ئەخمینییەکان) لە ژێر کاریگەریی ئەم کولتوورەی میدیاییەکاندا دێن نەک هەر تەنیا هونەری موزیک و گۆرانی بەڵکو هونەری نیگار و نووسینیش پیرۆز دەکەن، سیفەتی "پیرۆزی" دەبەخشنە تەنانەت نووسین و نیگاریش. داریووش پاشا لە دێری (٧٢-٧٦)ی ستوونی چوارەمدا لە کەلەکی شاخی بێستووندا، دوای سەرکەوتنی بەسەر میدیاییەکاندا، دەنووسێ:

(ئەی ڕەهگوزەر، ئەگەر تۆ ئەم نووسین و نەخش و نیگارانەی ئێرە خەراپ نەکەیت و بیانپارێزیت، ئاهوورامەزدا لە پشتت دەوەستێت و خێر و بەرەکەت دەخاتە ژیانتەوە...).

دەوڵەتی میدیا لە (٥٥٠ پ. ز) بەملاوە، ڕاستە، کۆتاییی پێ دێت، بەڵام زمان و کولتوور و دینی (زەردەشت) هەر دەمێنێتەوە: دینی ڕەسمیی دەوڵەتی هەخامەنشی بریتی بووە لە دینی زەردەشت. هەر بۆیەش دەبینین زمانی پارسیی کۆن (هەخامەنشی) زۆر سوودی لە زمانی ماد وەرگرتووە «چونکە زمانی میدیاییەکان ئەو زمانە بووە کە ئاڤێستای پێ نووسراوە، زمانێکی ئاینیی پیرۆز بووە: وەک زمانی عەرەبی کە زمانی قورئانە و دەبێتە زمانی ئۆفیسیاڵی هەموو ئومەتی ئیسلام».

ئەخمینییەکان تەنانەت نووسینی بزماریشیان لە میدیاکانەوە وەرگرتبوو، ئەمە جگە لەوەی، وەک مێژوونووسە یۆنانییەکان (هێرۆدۆت و گەزنەفۆن)

باسی دەکەن پارث و هەخامەنشی و ساسانییەکان هەمان دەستووری پۆشاک و شێوازی لەبەرکردنی جلوبەرگی میدیاییەکانیان بەکار هێناوە.

ئەم خاڵەمان بۆیە بەفراوانی ڕوون کردەوە بۆ ئەوەی درک بە ڕاستییەک بکەین: هەخامەنشییەکان (ئەخمینییەکان) هەمان مۆسیقای میدیاییەکان و کولتووری میدیاییەکان پەیڕەو دەکەن و گەشەی پێ دەدەن؛ تەنانەت لە سەردەمی بنەماڵەی ساسانییەکانیشدا، دینی زەردەشت و کولتووری ئاڤێستایی لە زۆربەی ناوچەکانی ژێر فەرمانڕەوایەتیی ساسانییەکاندا بەئاشکرا دەبیندرا: تا هاتنی ئیسلام و بە ئیسلامکردنی سەرتاپایی وڵاتی ئێران و کوردستان.

دوای لەناوچوونی دینی زەردەشتیش، مۆسیقا لە ناو کورداندا هەر پیرۆز دەمێنێتەوە، بەتایبەت لای یەزیدی و ئەهلی هەقەکاندا. تەنانەت من وا دەبینم: کە خودی شەهرامی نازری، ئەویش، کە خەڵکی کرمەشانە و پەروەردەی مۆسیقای ئەهلی هەقەکانە، لە سەرچاوەیەکی دینی و لە هەستێکی مەزهەبییەوە ئەو هەموو هونەرەی لێ هەڵدەقوڵێ. جارێکیان بەبیرمە ناوبراو لەسەر لاپەڕەیەکی کۆواری (ئاوێنە)دا گوتبووی: «مۆسیقاکەمان مەزنە، بەڵام خۆمان بچووکین». ئەم قسەیە، ناوەرۆکێکی ئایدیالیستانەی (خواپەرستانەی) هەیە لە هەمبەر هونەری مۆسیقا.

پیرۆزبوونی مۆسیقا لای ئەهلی هەق (کە د. محەمەد موکری باسێکی گرینگی بە فەرەنسی لەسەر نووسیوە)، هەروەها پیرۆزبوونی مۆسیقا بەهەمان شێوە لای یەزیدییەکان (کە مستەر ڕیچ و زۆر مێژوونووسی تریش قسەیان لەسەر کردووە) بەڵگەی بەڕاستگەڕانی ئەوەن کە مۆسیقا و گۆرانی لە زەمانی دێرینی وڵاتی کوردەواریدا لە هەستی خواپەرستییەوە واتە لە دینەوە هەڵقووڵاوە. مۆسیقا لە دینەوە بەوەلەد هاتووە. ڕۆژهەڵاتناسی ڕووس، پیتەر لیرخ لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا لەبارەی کورد، ئاماژە دەدات بە گۆرانییە دینییەکانی یەزیدییەکان کە لەسەر قەبری شێخ ئادێ دەیخوێنن کە لە ١١٦٠دا مردووە.

بۆ کەسێک نەشزانێ یان باوەڕیش نەکا کە ئەهلی هەق و مەزهەبی یەزیدی لە زەردەشتەوە هاتوون، کاتێ دێ لە ناوەرۆکی مەزهەبی ئەهلی هەق ورد بێتەوە، هەڵبەتا دەبێ باوەڕ بهێنێ کە چ پێوەندییەک لە نێوان مۆسیقا و مەزهەبی ئەهلی هەقدا هەیە. لە نامەی (سەرەنجام)ی سروودی (یارسان)دا هاتووە:

خوا فەرمانی دایە (بنیامین) کە گیان بەبەر ئادەمدا بکا،

بنیامینیش ئاوازی (ڕاست)ی بۆ ڕۆح ژەنی؛

بەم جۆرە ڕۆح چووە جەستەی ئادەمەوە.

ڕۆژهەڵاتناسەکان ئەوە دەگێڕنەوە کە گۆرانیبێژ و مۆسیقاژەنەکانی ئەهلی هەق پێش دەسپێکردن بە ژەنینی مۆسیقا و چڕینی گۆرانی، دەچوون دەف و تەمبوور و بلوێرەکانی خۆیان ماچ دەکرد ئنجا دەکەوتنە سەر ژەنین.

ژان دوورینگ: نەریتی مۆسیقای ناوەخۆییی ئەهلی هەق، لە (١٩٨٩) چاپ کراوە، باس لە مێژووی ئاواز و گۆرانی و واتای مۆسیقا و بایەخی مۆسیقا دەکا لەلای ئەهلی هەقەکان، ئنجا لە ئامێرە مۆسیقاییەکانیان دەکۆڵێتەوە و ڕەهەندە ڕۆحییەکانی مۆسیقای ئەهلی هەق شیتەڵ دەکاتەوە:

Jean During: La tradition musicale esoterique des Ahl-E- Haqq, in (Jean During, Musique et mystique dans les traditions de l Iran), Teheran- Paris, Leuven, Ed. Peters, 1989, P. 293- 520.

چاپە فەرەنسییەکەی ئینسیکلۆپیدیای ئیسلام لە لاپەڕە (١٤٠)دا جەختی لەسەر پیرۆزبوونی مۆسیقا لای یەزیدییەکان دەکاتەوە و دەڵێ: «یەزیدییەکان لە کۆڕی زیکر و ئاهەنگە دینییەکانی خۆیاندا مۆسیقا بەکار دێنن».

ئەمە جگە لەوەی کە مۆسیقا و گۆرانی لای یەزیدییەکان زۆربەی کات، بەشێوەیەکی پێکەوەییە، لە شێوەی زیکر و نوێژی گەلەکۆییدا.

ڕاستییەکەیشی، تاکو ئەمڕۆش لە ناو میللەتانی تریشدا، ئەم مۆسیقا دینییە، لای گەلێک گۆرانیبێژاە هاوچەرخەکان بە ئەمڕۆیی کراوە و هاوچەرخ

کراوە؛ وایان کردووە سەرنجی ئەورووپاش بۆ ئەم مۆسیقا دینییەی خۆیان ڕابکێشن. لەم بارەوە هیچ کەس ناتوانێ ئینکاری ئەوە بکات کە بەهرەی گۆرانیبێژی ناوداری پاکستانی (نوسرەت خان) کە من بەچاوی خۆم دیتم لە ناو هۆڵی شانۆی نیشتمانیی فەرەنسا لە پاریس بە گۆرانییە ناودارەکەی (عەلی عەلی..) سەدان خەڵکی فەرەنسیی هێنابووە کەڵکەڵەی سەما، لە سەرچاوەیەکی مەزهەبی و شیعەگەرییەوە هەڵقووڵاوە:

علی امام من هـــست و من هم غلام علی

هزار جـــان گرامـــی فدای نـــام علی..

ئەم گۆرانییە و زۆربەی گۆرانییەکانی تری نوسرەت خانی پاکستانی، لە هەستی دینییەوە هاتوون.

بەم شێوەیە، مۆسیقا لە یەکەم ئیمپراتۆریەتی کوردەوارییەوە، تا دەگاتە دوای بڵاوبوونەوەی ئیسلامیش (وەک پاشان باسی دەکەین) سەرچاوەکانی خۆی لە دین و هەستی مەزهەبییەوە هەڵگۆزیوە. ئەم دۆخەش دەقاودەق لەگەڵ فەلسەفەی فرێدریک هیگڵ یەک دەگرێتەوە کە پێی وایە هونەر سەرچاوەکانی خۆی لە (ڕۆحی ڕەها)وە هەڵدەهێنجێنێ، واتە لە (خوا/ الروح المطلق).

لە ماوەی خەلافەتی ڕاشیدیندا، بەتایبەتیش لە سەردەمی خەلیفە عومەر (٦٣٤) و خەلیفە عوسماندا (٦٤٤)، دینی ئیسلام بە کوردستاندا بڵاو دەبێتەوە و هەرچی مۆسیقا و کولتووری زەردەشتی هەیە وێرانی دەکات.

چۆن دەزانین ئیسلام کولتوور و مۆسیقای زەردەشتی خاپوور دەکات؟

چونکە بێگومان دینێک، هەر دینێک (بەتایبەتیش ئەگەر بەزەبری شمشێر هاتبێ) ئەگەر جێگە بە دینێکی پێش خۆی لەق بکات، بێگومان ئەوا جێگە بەکولتووری ئەو دینەش لەق دەکات و کولتووری ئەو میللەتەش تێک دەدات کە پێشتر باوەڕیان بەو دینە هەبووە.

دینی ئیسلام، لە بواری موزیکدا سێ شتی گرینگ و تازەی لەگەڵ خۆیدا فەرز کردە سەر کوردە زەردەشتییە بە موسڵمانبووەکان:

١- سەپاندنی ئیقاعی ژیانی تایبەتی عەرەب بەسەر کورددا. ئەمەش بووە هۆی فەرزکردنی ڕیتمێکی تازە و شێوازێکی نوێ بەسەر ژیانی کورد و بەسەر موزیکی کورددا (چونکە دینی زەردەشت، هەروەها میللەتی کورد لە سەردەمی زەردەشتدا ڕیتمی تایبەتی خۆی و شێوازی ژیانی تایبەتی خۆی هەبووە: شاخاوی، شاد، سروشتخواز. ئەو ڕیتمە لە ناو هۆرە و حەیران و لاوک و سیاچەمانە و تەنانەت لە ناو شیعرەکانی مەولەوی و بێسارانی و وەلی دێوانەشدا هێشتا ماوەتەوە).

خەلافەتی ئیسلام کەوتە بەعەرەبیکردنی نەزم و ڕیتمە کوردییەکان: هەرچەند تاکو ئەمڕۆش وەک دەزانین نەیتوانیوە ناوی کوردیی مەقامەکان (کە دیارە بەشێکیان کوردین و لە قامووسی زمانی کوردییەوە هاتوون) بیانگۆڕێت.

ئیسلام ڕیتم و مەقام و ئاوازە کوردییە زەردەشتییەکانی خستە چوارچێوە و قالبێکی ئەوتۆوە کە لەگەڵ ڕیتم و خاسیەتەکانی ژیانی خۆی، هەروەها لەگەڵ گەرووی تایبەتی خۆی بگونجێ. زۆر ئاگادارانە دەڵێم «گەروو» چونکە (گەرووی هۆرە) و (گەرووی گەرمیانی) و (گەرووی ئۆپێرایی) و (گەرووی حەیران) هەیە، (گەرووی عەتابە) و (گەرووی لاوک) و (گەرووی ئەفریقایی) و (گەرووی هەولێری) و (گەرووی جەبەلیی فوئاد بەللان) و (گەرووی بنەماڵەی نوسرەت خان) هەیە. (دەڵێن لە پاکستان هیچ بنەماڵەیەکی تر ناتوانێ دەقاودەق وەک ئەندامەکانی نوسرەت خان گۆرانی بڵێ، وەک چۆن هیچ عەتابەخوێنێکیش ناتوانێ وەک ئۆپێراخوێنێک ئۆپێرایەک بڵێ!).

هەر لە بواری ڕیتمدا، پێویستە ئاماژە بە کوودەتایەکی تریش بدەین کە عەرەب بەهۆی هێزی ئیسلامەوە لە بەستێنی ئاواز و دەنگ و ڕیتمدا دەیکا؛ ئەو کودەتایەی کە نەک تەنیا لە بواری موزیک بەڵکو لە بواری مۆسیقای شیعریشدا باندەستی خۆی جێ دەهێڵێ.

لە دەوروبەری سالانی (٧٧٠- ٧٨٠) شیعرناس و مۆسیقاناسێکی

موسڵمانی عەرەب بەناوی "خلیل بن احمد الفراهیدی (٧١٨ – ٧٩١)" دێت بەپێی چێژی شاعیرانی بیابانشینی وەک «عنترة بن شداد» و «زهیر بن الکلبی» و «طرفة بن العبد» و «امرء القیس»، واتە بەپێی ڕیتمی بیابان و چێژی جەزیرەی عەرەبی، واتە لەسەر بنچینەی ئەو شیعرە عەرەبییانەی کە لە سەردەمی جاهیلیی (پێش ئیسلام) دەنووسران و تەنانەت تا سەردەمی دوای ئیسلامیش هەر (لە سەردەمی خولەفای ڕاشیدین و ئەمەوییەکاندا) لەلایەن شاعیرانی وەک حسان بن ثابت و الفرزدق و جریر و کعب بن زهیر و عمر بن ربیعەوە لاسایی دەکرانەوە «بێگومان چونکە هاونەوا و هاوچێژ و هاوئاهەنگی ژیانی عەرەب بوون»؛ ئەم مۆسیقا و ڕیتمە عەرەبییانە دەکاتە بنەما و پێوەر بۆ نووسینی شیعر لە ناو شاعیرانی هەموو ئومەتی ئیسلامدا.

خەلیل کوڕی ئەحمەد ئەلفەراهیدی (٧١٨ – ٧٩١) هاوزەمانی بڵاوبوونەوەی ئیسلام، کێش و بەحرە عەرووزییە عەرەبییەکان بۆ مۆسیقای شیعری عەرەبی دادەمەزرێنێت (دەسنیشانیان دەکات)، ئنجا هەر یەکێک لە وەزن و ڕیتمە جۆراوجۆرەکان بە (بەحر) ناودێر دەکات: بەحری ڕەمەل، بەحری هەرەج، سەخەڕ، المجتث، الرجز.. هتد (تەنانەت ناوەکانیشیان چەنێک سروشتی بیابان و ژیانی دوورگەی عەرەبییان پێوە دیارە!).

ئەم کارە وا دەکات شاعیرانی سەردەمی خەلافەتی عەباسی (المتنبي، ابوالعلاء المعري، ابوفارس الحمداني، الشریف الرضي والبحتري..) پەرە بەم بەحرانە بدەن و بڵاویان بکەنەوە بەناو ئومەتی ئیسلامدا؛ بۆیە کاریگەریی دەبێ بەسەر ئەوەی کە لەمەولا شاعیرانی کوردیش وەک ئەحمەدی خانی و مەلای جەزیری تا دەگاتە نالی و مەحوییش (تەنانەت گەورە شاعیرانی تورک و فارسیش: فزووڵی، گەنجەوی، فیردەوسی، شیرازی..) لەمەودوا بێن تەنیا بە کێشی (مۆسیقای) عەرەبی شیعر بنووسن و واز لە مۆسیقای خۆماڵی یان کوردی بهێنن لە کاتی شیعرنووسیندا (هەندێ شاعیرانی وەک بێسارانی و مەولەوی و ئەوانەی تری نایانەوێ پابەندی کێشە عەرەبییەکان بن، نموونەی ڕیزپەڕن لە ناو شاعیرانی پێش سەدەی بیستەمدا).

٢- ئیسلام ئامێره مۆسیقاییەکانی خۆی، کە جیاواز بوون لە چاو ئامێره مۆسیقاییەکانی زەردەشتییەکان، سەپاندە سەر بەستێنە مۆسیقاییەکە؛ خستنیە چوارچێوە و قالبێکەوە کە بۆ ڕیتم و خاسیەت و گەرووی خۆی بگونجێ.. بەشێوەیەک کە ئەمڕۆ مەگەر تەنیا ڕۆژهەلاتناس و ئەوروپاییەکان بێن گەواهیی ئەوەمان بۆ بدەن کە بەشێکی زۆر لەو ئامێرە مۆسیقاییانەی ناو ئیسلام کورد دروستی کردوون؛ بە ژمارەیەکی زۆر لە مەقامات و ئاوازەکانیشەوە.

ئینسکلۆپیدیای بریتانی دەڵێ: تەمبوور کوردییە. زانای ئەڵمانی، کیرتیسارگ دەڵێ: کورد کەمانچەی دروست کردووە. ئەم ڕایەش، د. سوبحی ئەنوەر ڕەشد لە کتێبی «تاريخ الالات الموسيقيه فى العصور الوسطى» کە لە بەغدا لە ١٩٧٥چاپکراوە، لە لاپەڕە «٥٦» پستڕاستی دەکاتەوە. هەروەها موزیکناسی ئێران، د. مهدی فروغ: نفوذ علمى و عملى موسيقى ايرانى، انتشارات اداره كل نگارش فرهنگ و هنر، تهران: ١٣٥٤، ل «٨٣»دا دەڵێ: جۆرێک ئامێری (سوورنا)ی بچووک هەیە، دەنگی زۆر خۆش، زۆرتر لە ناو هۆزەکانی کورددا برەوی هەیە. francois- Rene Tranchefort لە کتێبی Les in- struments de Muique dans Le mond » کە لە (١٩٨٠) لە پاریس لە دەزگای seuil چاپ کراوە، ل (١٠٠ و١٦٠) بنەچەی گەلێک لە ئامێره مۆسیقاییەکانی ڕۆژهەلات، وەک (تەنبوور) و (بوزک/ بزخ Bazuq) دەگێڕێتەوە بۆ کورد، دەڵێ کە لە سەرەتادا کورد ئەو ئامێره مۆسیقاییانەی داهێناوە.

ئینسکلۆپیدیای ئیسلام (چ. فەرەنسی، ل ١٤٠) ئاماژە بەمە دەدات کە (ئامێری مۆسیقا لە ناو کوردانda بەزۆری لەلایەن پیشەگەره ناوچەییەکانی کورد خۆیەوە دروست دەکرێت).

ئەم تێبینییە ئەگەر ئەو زەمانە دێرینەی سەرەتای ئیسلام بگرێتەوە یان مەبەست تەنیا لە سەدەکانی ناوەڕاست بێت، ئەوە ناشارێتەوە کە ئیسلام چەند ئامێرێکی مۆسیقای تازە و جیاوازی خۆی فەرز کردە سەر ناوەندە

مۆسیقاییە کوردییەکان؛ لە هەمان کاتیشدا سوودی لە ئامێرە مۆسیقاییە کوردییەکان بینی و مۆری نەتەوەیی (عەرەبی) خۆی لکاندە سەر کوردییەکانەوە.

٣- بیری یەکخستنی خوا (توحید فكرة الله) کە لە دینی ئیسلامدا هەیە و بەڵام بیرۆکەی (خوا) لەلای زەردەشتییەکاندا بەشێوەیەکی جیاواز بوو.

مێژوونووسی گریک، هێرۆدۆت (٤٨٦- ٤٢٠ پ. ز) دەڵێ: مووغەکانی زەردەشت بڕوایان بە خواوەندی (جمکانە) هەبووە، واتە لە کاتێکدا بڕوایان بە پەرستنی هێزەکانی سروشت: وەک: خۆر، مانگ، باران، ئاگر، برووسکە... هەبووە، هاوکات هەریەک لەمانەشیان وەک (خواوەند)ێک داناوە. پەرستنیشیان بۆ ئەم دیاردانە لەو روانگەیەوە بووە کە ئەم خواوەندانە کەڵک و پیت و بەرەکەتیان بۆ مرۆڤ هەیە و لە بەرژەوەندیی مرۆڤدان، واتە: هێزی خێر و چاکەن. بەڵام هاوکات هەر ئەم خواوەندانە، وەک نموونەی: باران، ئاگر، خۆر... زیانیشیان بۆ مرۆڤ دەبێ و دەبنە سۆنگەی دروستبوونی کارەساتی وەک: لافاو، یان پێچەوانەکەی کە، وشکەساڵی، هەژاری، نەخۆشی، بەدواوەیە.

هەر بەو جۆرە خواوەندی (ئاگر)، ئەمیش چەند کەڵکی بۆ مرۆڤ هەیە، ئەوەندەش زیان و مەترسیی و کارەساتی گەورەی لێ چاوەڕوان دەکرێ. بەواتەیەکی تر: هەریەکە لەم خواوەندانەی سروشت بریتین لە جمکانەی خێر و شەڕ؛ ئەم گەوهەری جمکانەیییەی خێر و شەڕەیشیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتووە. ئەم جمکانەیییەش تاهەتایە لە یەکتر جیا ناکرێنەوە.

ئیسلام هەرچی شتێکی تری لای کورد گۆڕیبێ، نەیتوانی بەهیچ شێوەیەک پیرۆزبوونی مۆسیقا لە لایان بگۆڕێت. ئەمەش چونکە لە دینی ئیسلام خۆشیدا مۆسیقا (بە مەرجێک ئەگەر تەنیا بریتی بێت لە تەهلیلە و خواپەرستی و دەربڕینی عیرفان) ڕێزی لێ دەگیرێت و ڕێگەی پێ دەدرێت؛ قەدەغە ناکرێت.

لە ئەوروپاش، تا سەدەکانی پێش ڕێنسانس (سەدەکانی ١٥ و ١٦)،

مۆسیقای میللی بەچاوی سووک تەماشای دەکرا. ئەمەش چونکە هەم دەوڵەت و هەم کەنیسە دژایەتیی گۆرانیبێژە گەڕۆک و مۆسیقا میللییەکانیان دەکرد. پۆل هنری لانگ لە کتێبی (Curt Saches : Our Musical Hertiage, N.Y. 1984) دەڵێ: « لە سەدەی سێزدەم ئەم گۆرانینبێژە میللی و مۆسیقاژەنە گەڕیدانە لای خەڵک خۆشەویست بووبوون، ڕۆڵی شانۆ و تەلاری مۆسیقایان لە ناو خەڵکدا دەبینی. تا سەدەی چواردەمیش، گۆرانیبێژە میللی و مۆسیقاژەنە گەڕیدەکان، سەبارەت بەوەی کە ئازادی و هێزێکی زیاتریان پەیدا کردبوو، دەوڵەت ڕێگەی لێ دەگرتن و دژایەتیی دەکردن: چونکە دەیانتوانی بانگەواز بۆ ڕاپەڕینێکی کۆمەڵایەتی یان سیاسی بکەن». لە ساڵی ١٣٢٥ پاپا، یۆهانسی دوازدەم، بە دەرکردنی فەرمانێکی دینی «ئەم ڕەوتە تازەیەی مۆسیقای» قەدەغە کرد؛ چونکە، پاپا یۆهانسی دوازدەم دەیگوت: «لە جیاتی چڕینی میلۆدییە کۆن و باوەکان دێن میلۆدیی تازە و داهێنراو دەخوێننەوە. میلۆدیی توند و خێرا ئیزافە دەکەنە سەر ئاوازەکانی کتێبی پیرۆز. هەموو ڕازاندنەوە و شتەکانی تریشیان وا دەکا کە گوێگر لە ڕێی ئیمان لابدا». هەروەها لە ساڵی ١٤٠٢ ئەنجوومەنی عەوامی ئینگلتەراش بڕیارێکی بەمەبەستی مۆسیقا و گۆرانیی غەیرە دینی دەرکرد.

بەم شێوەیە، موزیک و گۆرانی لە سەردەمی ئیسلام بەملاوە، بە هەمان ناوەرۆکە دینییەکەی، بەڵام لەسەر چەند بنچینەیەکی مەزهەبی جیاواز و تازە، بەردەوام دەبێ.

ئیبن خەلەکان لە کتێبی (وفیات العیان)، لە (١٢٨٢)، هەروەها ئەلحەنبەلی لە (شذرات الذهب) لە ساڵی ١٤١٧ باس لە بەکارهێنانی ئامێری دۆڵ و تەپڵ دەکەن لە هەولێری ساڵانی ١٢٨٢ و ١٤١٧.

ئیبن مستەوفی باسی لەوە کردووە کە سۆفییە کوردەکان (متەسەوفەکان) لە هەولێر، بۆ کاتی زیکر مۆسیقایان بەکار هێناوە؛ هەروەها باسی بەکارهێنانی بلوێر دەکا لە هەولێر.

ئیبن خەلەکان لە ساڵی ١٢٨٢ لە "وفیات العیان"، ل١١٨، هەروەها النعیمی:

الدارس في تاريخ المدارس (١٥٢٠ م)، ل١٥٧ باس لەوە دەکەن کە لە سەردەمی سوڵتان مزەفەر گۆگبەریدا گۆرانیی دینی و دەف لێدان هەبووە، هەروەها سروود و گۆرانی لە ڕۆژی لەدایکبوونی پێغەمبەردا گوتراوە.

مۆسیقاناس و مێژوونووسی فەرەنسی، ژان دوورینگ: زیکر و گۆرانییەکانی دەروێشەکانی تەریقەتی قادری، لە ١٩٨٩ چاپ کراوە، باس لە مێژووی تەریقەتی قادری و ئاواز و زیکر و گۆرانییەکانی قادری و واتای مۆسیقای تەریقەتەکە دەکا، پاشان زیکری قادری لە قادری لە ئەستەمبۆڵ و سنە. لە کۆتاییشدا نۆتەی چەند ئاوازێکی تەریقەتەکەی نووسیوەتەوە.
Jean During: Zekr et chantes des dervichs Qaderi du Kurdistan, in (Jean During, Musique et mystique dans les traditions de l Iran), Teheran- Paris, Leuven, Ed. Peters, 1989, P. 239- 290.

زۆر گرینگە ئاماژە بەمە بدرێ کە پێشکەوتنی مۆسیقا و گەشەسەندنی گۆرانی تەنانەت لە سەردەمی ئیسلامیشدا، دیسانەوە بەبێ ڕۆڵی کورد بەهیچ شێوەیەک مومکین نەبوو: کورد ڕۆڵێکی گرینگ و بەزەبری بینیوە لە گەشەسەندنی موزیک و پەرەسەندنی ئاواز و گۆرانی لە ناو جیهانی ئیسلامدا. ئەم بۆچوونەی سەرەوە لە سەرەتادا وەک خۆفشکردنەوەیەکی ناسیونالیستانە دێتە پێش چاو، بەڵام ئەم ڕاستییەی لە خوارەوەدا باسی دەکەین، هەموو مێژوونووس و ئیماندار و مۆسیقاناسێکی موسڵمان و غەیرە ئیسلامیش باش دەیزانێ:

ئێمە لە بەشی کرۆنۆلۆجیاکەدا بەفراوانی باسمان لە ڕۆڵی شاری هەولێر، واتە باسمان لە ڕۆڵی سوڵتان موزەفەر کردووە کە چۆن بەهۆی مەولوودنامەکانەوە کارێکی و ادەکات موزیک و گۆرانیی دینی لە جیهانی ئیسلامدا ببووژێتەوە، کە لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی بووژانەوەی مەقامات و پەلوپۆهاوێشتنی هونەری مەقام و ئاواز و لەدایکبوونی چەندان جۆری مەقام لە هەموو وڵاتانی عەرەبدا کە ئەمڕۆ بەناوی (مەقاماتی بەغدادی) شۆرەتی پەیدا کردووە.

مـوزەفـەرەدین گـۆگـبـەری، نوێنەری سـەلاحـەدینی ئـەیووبی لـە هـەولێـر، هـەندێکیش پێی دەڵێن سـوڵتان مـوزەفەر کـە لە ١٢٣٣ کۆچی دوایـیـی کردووە و مـاوەی فـەرمـانڕەوایـەتیـیـەکـەی لە هـەولێـر برێتی بووە لە ١٢٢٨- ١٢٣٣، لە ساڵی ١٢٢٠ بۆ یەکەم جـار لە مێژووی هـەموو وڵاتانی عـەرەب و ئیسـلامـدا یادکردنەوەی ڕۆژی لەدایکبوونی پێغـەمبـەر دەکاتە نەریتێک: لە هـەولێر و لە سـەرتاپای جیـهانی ئیسلامدا هـەر لە مـانگی سـەفەرەوە تا سـەرەتای رەبیـعی ئەوەل بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەر ئاهـەنگ ساز دەکەن؛ مۆسـیقا و گۆرانی دەچڕن. چەندین هـەزار درهـەمی زێڕی دەدایە هـەرچی مـەلایەک لە ئەفریقا، لە ئاسیا مەولوودنامەی بنووسیایە.

سـوڵتان مـوزەفەر لە کـاتی شـەڕی دژ بە مـەسـیحـییـەکان لەگەڵ سەلاحـەدین ئەیووبی چووەتە قودس، لەوێدا مەسـیحییەکانی دیوە چۆن حـەزرەتی مەسیح و یادی پێـغـەمبـەری خـۆیان لە ڕێگای مـۆسـیـقـا و هونەرەوە بەرز ڕاگـرتووە و گۆرانییان بـەسـەردا هـەڵگوتووە لە ناو کڵێسـاکـاندا؛ سـوڵتـان موزەفـەر کـاتێ گـەڕاوەتەوە هـەولێر، بڕیاری دەرکـردووە کـە ئەویش فـەرمـان بداتە ئومـەتەکـەی خۆی بەهـەمان شـێوە بە مۆسیقا و گۆرانی یادی پێغەمبەری خۆیان شکۆمەند ڕابگرن و «مەولوود» واتە سازدانی ئاهـەنگ لەو ڕۆژەدا دەکات بە نەریتێک.

بەم شـێوەیە مـەولوودنامـە دەبێـتە ژانرێکی ئەدەبی و هونـەری؛ لێرەشـەوە سازدانی ئاهـەنگ و مـۆسیقا، بێگومان، کاریگەرییـەکی بەزەبر دەنوێنن بەسـەر پەرەسەندنی مۆسـیقا و مەقامات و گۆرانی لە وڵاتانی عەرەب و ئیسـلامدا، کە قـۆریاتی تورکـمـانیش پاشـان لەمـەوە سـەرهـەڵدەدا (هـەر بـۆیەش ئەم نەریتـە ئەمڕۆ زیاتر لە هـەولێر و کـەرکووکدا هـەیە. مـامـۆسـتـا ئەنوەر قـەرەداغی پێی ڕاگەیاندم کە کـاسـێتێکی مـەولوودی پێـغـەمبـەری لەلایە کە لە سلێمـانی سـاز کراوە: لەو مـەولوودەدا دەنگبێژەکان بەدەم ژەنینی کەمـانچەوە گۆرانی بەسـەر پێغەمبەردا هـەڵدەڵێن).

کـەواتە، ئەگـەر هـەولێـر بێـشکەی لەدایکبـوونی مـەولـوود و مـەولوودنامـە و مـەقـامـات بێت، هـەر بۆیەش بە سـەیر نازانـدرێ کـە یەکـێک لە یەکـەمین ئەو

مۆسیقاناس و نووسەرانەیش کە لە سەردەمی دوای عەباسییەکاندا (نەوەد ساڵێک دوای سوڵتان موزەفەر) باسیان لە مەقامات و ئاواز و گۆرانی کردبێ؛ دیسان شاعیرێکی کوردی هەولێری بووە، لە بەغدا نێژراوە، بەدرەدین ئەربیللی (١٢٨٧– ١٣٥٤)، کە لە ساڵی ١٣٢٨ کتێبێک لەبارەی ئاواز و گۆرانی و مەقامەکان بەناونیشانی (جواهر النظام في معرفة الانغام) بەزمانی عەرەبی دەنووسێ، کە باس لەو مەقامانە دەکا لە هەولێر و لە ناوچەکەدا باو بوونە.

ئەم ڕاستییانە ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە کورد، بەتایبەتیش شاری هەولێر و ڕۆڵە ناودارەکەی، سوڵتان موزەفەر، چ ڕۆڵێکی گەورەی هەبووە لە بڵاوکردنەوەی مۆسیقا و گۆرانی بەناو وڵاتانی ئیسلامدا؛ ئەوەش دەسەلمێنن کە لەو سەردەمەدا مۆسیقا و گۆرانی لە هەولێر و لە کوردستاندا لە چ ئاستێکی گەشانەوەی خۆیدا بووە: هەر لە ئەنجامی ئەمەشدایە کە مۆسیقاناس و هونەرمەندی مەزنی وەک زەریاب، دواتر، لەم کولتووره دەوڵەمەندەی کوردستانەوە بەوەلەد دێن. مێژوونووس و مۆسیقاناسی فەرەنسی، ئەندرێ کلۆت، باس لە کوردبوونی زەریاب دەکات و ڕۆڵی لە مێژووی مۆسیقای ڕۆژهەڵاتدا:

Andre Clot: Ziryab un Kurde Celebre, in Les Kurdes dans l actualite, Pub. de l Institut Kurde de Bruxelle, Bruxelle: 2003, P. 16-17.

## قۆناغی سێیەم: مۆسیقای لیریک

ئەمە ئەو قۆناغەیە کە مۆسیقا سەرچاوەکانی خۆی لە هەستی ڕۆمانسی و ژن خۆشویستن و خرۆشانی سۆز و غەریزەکانەوە هەڵدەهێنجێنێ، دواتریش لە هەستی نەتەوەپەروەرییەوە.

هەڵبەتا سەرهەڵدانی ئەم قۆناغە مانای ئەوە نییە کە لیریک سەرچاوە دینییەکەی مۆسیقای بەیەکجاری و تاهەتایە کوێر کردەوە، بەتایبەتیش لای گەلانی تری دنیا، وەک دەبینین تاکو ئەمرۆش ئەو مۆسیقا و گۆرانییانەی لە هەستی دینی و لە دینەوە ئاو دەخۆنەوە هێشتا هەر بەردەوامن. نوسرەت خانی پاکستانی و مۆسیقای تیبتییەکان و هەندێ لە مۆسیقا و گۆرانییەکانی



مۆسیقاژەنەکانی مێزۆپۆتامیا ، سەدەی شازدەم

ئێران نموونەیەکی زیندوون.

پێویستە ئاماژە بەمەش بدرێت، هاوزەمانی سەرهەڵدانی گۆرانیی دینی و مۆسیقای ئیسلامەتی، مۆسیقای لیریک و گۆرانیی لیریک هەر هەبووە:

"ابن الشعار الموصلي له قلائد الجمان" لە ساڵی ١٢٥٦، ل ٥٢٢ دەڵێ: زۆر لە مۆسیقارە کوردەکانی وەک "صدقه بن محمد بن القاسم بن محمد بن علی"، ناسراو بە (ابوالبر الاربيلي، کە ئاوازدانەر و مۆسیقارێکی شارەزای هەولێر بووە و لە ساڵی ١٢١١ ژیاوە، ئاوازی بۆ گۆرانیبێژەکان داناوە و هۆنراوەی گۆرانیی بۆیان نووسیوە. ئەهلی تەرەب گۆرانییەکانی ئەویان وەرگرتووە و لە مەجلیسەکانی خۆیان گوتوویانەتەوە.

القزوینی: اثار البلاد ، ل ٤٨٥، باس لە شایی و هەڵپەڕکێ و گۆرانی دەکا لە شاری هەمەدان.

لە ناو تابلۆی دووەمی شەرەفنامە لە ساڵانی (١٦٠٠)دا عوود و ساز دەبینین، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە عوود و ساز ئامێرێکی وا بوونە لە کۆنەوە لە کوردستاندا بۆ دەربڕینی شادی و خۆشی و گۆرانی بەکار هاتوون.

فارقی لە کتێبی "تاريخ الفارقي"، ل ١٧ و ١٢٢ و ١٧٠، لە ساڵی ١١٨١ باس لە میری کورد، "نصر الدولة المرواني" و خێزانەکەی دەکا کە چۆن ئاهەنگیان لە شاری میافارقین و دیاربەکر ساز داوە و گەمە و گۆرانی و سەمایان تێدا گێڕاوە.

جگە لە فارقی، گەڕیدەیەکی تریش بەناوی "ابن کثیر: البداية و النهاية، ص٩٣" باسی لە میری کورد، "نصر الدولة المرواني" کردووە و دەڵێ:

«ئەو گۆرانیبێژانەی دەهاتنە ئاهەنگەکانی، پێنج هەزار دیناری دەدانێ، بەڵام ئەو گۆرانیبێژانەی کە بەردەوام لە ئاهەنگ و شەوبێری و ڕابواردنەکان ئامادە دەبوون ئەوا دوو سەد هەزار دیناری دەدانێ». فارقی دەڵێ کە میری کورد، "نصر الدولة المرواني" جاریەیەکی (کەنیزەکێکی سەماکەری) لە وڵاتی میسرەوە هێنابوو بۆ میافارقین -نزیک دیاربەکر- ناوی فەرجیە بوو کە

ئامێری عوودی دەژەنی.

فارقی دەڵێ کە میری کورد، "نصر الدولة المرواني" لە میافارقین زۆر حەزی لە گوێگرتن لە شیعرەکانی "ابی نواس" بووە.

میرە ئەیووبییەکانیش زۆر حەزیان لە مۆسیقا و گۆرانی و ئاهەنگ و شەوبێری بووە. ابوالفداء: مختصر کتاب البلدان (١٣٣١ م)، ل١٧٨ بەفراوانی باسی دەکا، بەتایبەتیش ناوی میری ئەیووبی (الملك الافضل) دەهێنێ کە شەیدای دەنگی گۆرانیبێژێکی ژن بووە بە ناوی (عەجیبە) کە شەوان هاتووەتە لای و بە ئامێری (چنگ) مۆسیقای بۆ ژەنیوە.

هەروەها "الحنبلي: شفا القلوب، ص ٣٨١" لەگەڵ "ابن العدیم: بغیة الطلب، ص٩٨٣" ئەوانیش باسیان لە میرە ئەیووبییەکان کردووە کە زۆر حەزیان لە مۆسیقا و گۆرانی و ئاهەنگ و شەوبێری بووە. باس لە گۆرانیبێژێکی ناوداری ئەییووبییەکان دەکا کە ناوی (ابوالعباس الهذباني الکوردي) بووە و ناسراو بووە بە سەلاحەدین ئەربیللی و لە (١٢٣٣) واتە لە سەردەمی میر "المغیث الایوبي" ژیاوە و هەر لە مەجلیس و دیوەخانەکانی ئەویش ماوەیەک گۆرانیی گوتووە. ئەمە جگە لەوەی کە مێژوونووسەکان ئاماژە بەمە دەدەن کە گۆرانیی زەمبیلفرۆش لە سەردەمی دەوڵەتی دۆستەکیدا گوتراوە.

هۆی گەشەسەندنی مۆسیقای لیریک (ڕۆمانسی و نیشتمانی) دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پێشکەوتن و گەشەسەندنەی لە ژیانی ناوچەکەدا هاتە پێشەوە. لە کۆتاییی سەدەی نۆزدەم بەملاوە گۆڕانکارییەکی هەژەند و فراوان لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و شارستانیی کورددا ڕوو دەدەن، لەوانە: دەرکەوتنی ئافرەت لە ناو ژیاندا شانبەشانی پیاو، دروستبوونی چەندان پێوەندیی جۆراوجۆری کوردستان بە ئەورووپاوە لە ڕێگەی ئەستەمبۆڵەوە، هەروەها پێشکەوتنەکانی ژیانی پەروەردەیی و خوێندەواری و بازرگانی، هەروەها سەرهەڵدانی بیری نەتەوەخوازیی کورد. هەموو ئەمانە دەبنە هۆی ئەوەی کە هەستی لیریک، نۆستالژیا، هەروەها هەستی ڕۆمانسی و سۆز، کە ئێمە لە سەرەتاوە ناومان لێ نا (لیریک) لە موزیک و گۆرانیی کوردیدا سەرهەڵبدەن.

ئەم قـۆناغـە پێم وابێ لە نـاو عـارەب و تورک و فـارسـەکـاندا زۆر زووتر و پێشتریش دێتە کایەوە، بەتایبەتی لە ناو چینی دەسەڵاتداری خۆشگوزەرانی خەلیفە و سوڵتانەکاندا. ئەمەش چونکە ڕابواردنی ناو دیوەخانی سوڵتان و حەرەمی خەلیفەکان، هەروەها ڕابواردنی ناو دەرباری پاشا و والی و ئەمیرەکان بێگومان تەڕەب و مۆسیقای دەویست، گۆرانی و سەما و جونبوش و بەزم و بادانی دەویست.

لە ئەورووپاش بەهەمان شێوە، لە سەدەی ڕێنسانس بەملاوە، وردە وردە مۆسیقا دەیویست ئۆتۆنۆمیی خۆی وەربگرێت و لە کڵێسا جودا ببێتەوە. ڕەوتی میللی، هێدی هێدی، بەرەو مۆسیقایەکی نادینی و ناکڵێسایی هەنگاوی دەنا. لە ١٥١٧ تا ١٥٨٦ هەوڵدانەکانی مارتین لووتەر Luther (١٤٨٣- ١٥٤٦) و جۆن فۆکس و کالڤان بۆ ریفۆرم لە ناو دەوڵەت و کۆمەڵگەی ئەورووپیدا دژی دەسەڵات و کەنیسە لە پێناو ئازادکردنی مرۆڤ و گەیشتن بە مافەکانی (کە مەزهەبی پرۆتێستانتی لێ کەوتەوە) ئەم ڕەوتەیان بەهێزتر کرد. ئاهەنگسازی هۆڵەندی، ئۆرلاندۆ دی لاسۆ (١٥٣٢- ١٥٩٤)، هەروەها ئاهەنگسازی فلاندەری، ئیسحاق (١٤٥٠- ١٥١٧) کەرنەڤاڵی وایان سازدەدا کە لە ناو خەڵک و لەسەر جادەکاندا پێشکێش بکرێن. بەدرێژاییی سەدەی شازدەم و لە سەرەتای سەدەی حەڤدەمدا، چەند ئاهەنگسازێک لە ئیتاڵیا و ئینگلستان چەند هەنگاوێکی تریان نا لە ڕاستەشەقامی دەوڵەمەندکردنی مۆسیقای غەیرە کڵێسایی. ئەمەش بەسازدانی مۆسیقا و گۆرانی، بەشێوەیەک کە بشێت لە ماڵەوە و لە مەجلیسەکاندا گوێیان لێ ڕابگریت.

هەوڵدان بۆ بە دنیاییکردنی هونەری مۆسیقا لە سەردەمی ڕێنسانس بەملاوە، بووە هۆی ئەوەی دراما بێتە ناو مۆسیقاوە، واتە گەیشتە ئەوەی کە ئۆپێرا (ئەو درامایەی کە لەگەڵ مۆسیقا پێکەوە خۆیان بەیان دەکەن) لە کۆتاییی سەدەی شازدەم و لە سەرەتای سەدەی حەڤدەمدا بۆ یەکەمین جار لە شاری فلۆرەنسا و ڤینیز لە ئیتاڵیا سەری هەڵدا: ئۆپێرا لە دەرەوەی کڵێسا،

بۆ هەموو خەڵک پێشان دەدرا و لە مەراسیمەکانی کلێسا جودا بووبووەوە؛ تا کار گەیشتە ئەوەی کە چینی خوارەوەی کۆمەڵ لە ڕێگەی ئۆپێراوە دەرفەتی ئەوەی پەیدا کرد بتوانێ ڕەخنە لە سەردەم و لە دەسەڵات بگرێ.

لە کوردستاندا ئەم قۆناغە تازەیەی (لیریک) لە مۆسیقا و گۆرانیی کوردیدا زۆر جار یەکانگیرە بەهەستێکی نۆستالژییانەی نەتەوەباوەڕی و نیشتمانپەروەری (بۆ نموونە لای کاوێس ئاغا). بۆیەش دەبینین لەو سەردەمەدا ژانرێکی مۆسیقاییی تازەش سەرهەڵدەدا: سروود، کە ژانرێکی مۆسیقاییی سەدەی بیستەمە و تەعبیر لە هەستی نیشتمانپەروەری یان نەتەوەپارێزی دەکا.

لە کۆتاییی سەدەی نۆزدەم بەملاوە ئەم ڕەوتە هێندە پەرەی سەند و بڵاوبووەوە تا وای لێ هات مۆسیقا یان گۆرانی ببێتە ئامراز و دەسکەلایەکی بەتەواوەتی سیاسی؛ بۆیە گەیشتە ئەوەی کە لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەملاوە هەر دەوڵەتێکی ڕۆژهەڵات سروودێکی نیشتمانیی خۆی هەبێت. (لەمەش گاڵتەجارتر، ئەمڕۆ، زۆر جاران تاقمێک کاتێ کودەتا بەسەر تاقمێکی دیکەی دەوڵەتدا دەکەن، دێن وێڕای گۆڕینی وێنەکانی سەر ئاڵای ئەو دەوڵەتە، زۆر جار سرووده نیشتمانییەکەیشی دەگۆڕن. گەلێک جار هەر حزبێکیش ویستوویەتی سروودی تایبەتیی خۆی هەبێ).

سەرهەڵدانی سروود لە ناو کولتووری کورد لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بەهۆی کاریگەریەتیی سەرهەڵدانی ناسیونالیزمی کوردییەوە، لە ڕێگەی ئەو نووسەرانەوە هاتە ناو کولتووری کوردەوە کە چووبوون لە ئەستەمبۆڵ ژیابوون و دیبوویان کە لەوێش هونەرمەندانی تورک، ئەرمەن، عەرەب بەهۆی مۆسیقا و گۆرانییەوە دەتوانن نیشتمان و نەتەوەی خۆیان شیرین بکەن.

زێوەر و پیرەمێرد نموونەی ئەو جۆرە نووسەرانەن کە کاتێ لە ئەستەمبۆڵەوە گەڕانەوە سروودیان هێنایە ناو کولتووری کوردەوە کە پاشان گەیشتە بەختیار زێوەر و بێکەس و ئنجا لە ساڵانی سییەکانیشدا دڵداری شاعیر هات سروودی نەتەوەییی (ئەی ڕەقیب)ی نووسی کە تا ئەمڕۆ مارشی

نەتەوەییـمـانە. بەم شـێـوەیە، لـە سـەدەی نۆزدەم بەمـلاوە، مـۆسـیـقـا وردە وردە لەمـە دەوەسـتـێ کـە چـی تر لـە مـەزهـەب و لە هـەسـتـی دینییـەوە ئاو بـخـواتـەوە؛ بەڵکو بەهرە و ئیلـهـام لـە نۆسـتـالژیای نەتـەوەیی (نیـشـتـمـانپـەروەری)یەوە، زۆرتریش بـەهرە لە سـۆز و ئەوینـی جـەسـتـەیی و هـەسـتـی ڕۆمـانسـیـیـەوە وەردەگرێت: «تەڕەب» دێتـە ئاراوە. «قـەووال» و «سـەلاکێش» هـەر دەمـێنن بـەڵام وردە وردە «موتڕیب» و «گۆیندە» و «چاوەش» جێگەیان دەگرنەوە.

ئەم شـیـتـەڵکردنـەوە و بۆچوونـەی پێش چاومـان خـست، بێگومـان تەنیـا لەبارەی کولـتووری مۆسـیـقـای کوردەوە ڕاست نییـە، بەڵکو لەگەڵ کولـتووری مـۆسـیـقـایی زۆربەی نـەتەوەکـانی ڕۆژهـەلاتیش (عـەرەب، فـارس، تورک..) پێکەڵپـێک دەبێـتـەوە (بەجـیـاوازیی ئەوەی کـە لای ئەوان، سـەبارەت بە پێشکەوتنی شارستانی و سەرمایە لای ئەوان، هەروەها سەبارەت بەهەبوونی دەربار و تەلارەکانی پاشایەتی و سەڵتەنەت لای ئەوان، مۆسـیـقـای لیریک و دنیاخواز کە بەهرە لە سۆز و شادی و خۆشـەویستیی دنیاییـیەوە وەردەگرێت، چەندان سەدە پێش ئێمە لە لایان لەدایک بووە).

مۆسیقا و گۆرانی، لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەملاوە، دوای ئەوەی ڕەگ و ڕیشـەکـانی خۆی لە دین و مـەزهـەب داپـچـڕی؛ لەگەڵ سـەرهـەڵدانی دەوڵەتی نوێ و ژیانی تازە، کەوتە دۆخێکی جیاوازەوە:

١- لەلایەکـەوە کـەوتە ناو باوەشی دنیـاخـوازی و ئەوینی جـەسـتـەیی و ڕەزی هەنـار و لیـمـۆ و نارنج و سـێـوە لاسـوورەکـانی جـەسـتـەی ژن و هـەسـتـە ڕۆمـانسییەکانەوە. نموونە: شەهـابە، ڕەشـۆڵ، حـەمەی مـاملێ، عەلی مـەردان، حەسەن زیرەک، محەمەد عارف جەزراوی.. هتد.

یەشـار کـەمـال دەڵێ کـە لە کـۆتـاییی سـاڵانی ١٩٢٠ و سـەرەتـای سـاڵانی ١٩٣٠دا «مـاڵی ئێـمـە بەمـەوە بەخـۆی دەنازی کـە لاوکبێـژ و شـایەری مـیلـلیی هـەرە گـەورەی کـورد (عـەبـدال زەینەکی Abdal Zeyniki) تەشـریـفی هـاوردبووە مـاڵی ئێـمـە و چەندان جـار لە ژێر بـنمـیـچی مـاڵی ئێـمـەدا بووە کـە لاوک و

داستانەشیعری خوێندبووەوە. عەبدال زەینەکی بۆ من ئەسحابەیەک بوو. تەنانەت لاوکبێژە کوردەکانی تریش، ئەوانەی دەهاتنە ماڵەکەمان، بەهرەیان لە داستانەکانی عەبدال زەینەکی وەرگرتبوو.

مەیلی تەکەبەروم یۆختی دونیادەن شان ئیستەمام
عیزەتی نەفسە زەنگینەم جاھ و سوڵتان ئیستەمام
ئۆڵورسە یارمنەن سەحەردە بیر چادرم
کەعبەیە قەسەم ئۆڵسن خان و خەرمان ئیستەمام

ئەمەی سەرەوە شیعرێکی تورکییە، نووسینی شاعیری عوسمانلی: فزووڵی؛ گۆرانیبێژی کوردی هەولێری، شەهابە، کە هەم بەکوردی و هەم بەتورکمانیش سترانی گوتووە، لە ساڵانی (١٩٢٠) بە مەقام ئەم شیعرەی فزووڵیی گوتووە. کوردییەکەی دەبێتە ئەمە:

نیمە مەیلی تەکەبور لە دنیا هیچ شەئن و شانێکم ناوێ
بە عیززەتی نەفسی خۆم زەنگین کورسیی هیچ سوڵتانێکم ناوێ
لەو دەشتە تەنیا چادرێکم ئەگەر هەبێت و یار لەگەڵمدا
سوێند بە کەعبە وەڵڵاهی هیچ خان و خەرمانێکم ناوێ

٢- مۆسیقا لەلایەکی تریشەوە، تووشی بوو بەتووشی حکوومەت و سیاسەتباز و شۆڤێنیستەکان و سیاسەتوانەکان و ئەو دەوڵەتانەی کە دەیانویست دژ بەهەموو ئەوانە ڕاوەستنەوە. نموونە: کاوێس ئاغا، تایەر تۆفیق، ڕەفیق چالاک، شڤانپەروەر.. هتد.

ئەم ڕەوتە لە دوو فۆرمدا خۆی دەردەبڕێ، یەکەم: گۆرانی، بەتایبەتیش لاوکەکان. فۆرمی دووم: سروودەکان.

یەشار کەمال لەم بارەوە، دیسان گەواهیمان بۆ دەدات و دەڵێ:

«بۆ یەکەم جار گوێم لێ بووبێ باسی ڕاپەڕینی کوردان کرابێ، دیسان هەر لە ڕێگەی لاوک و گۆرانییە مىللییەکان و داستانەکانەوە بوو. من لە باوکمەوە بیستم کە مامی ئەو، واتە میری کورد (گولیخان بەگ) گوێزرابووەوە ئێرە،

بەخۆی و بەماڵ و منداڵەوە لێرە لە تاراوگەدا دەژیا. یەکسەر زوو لە هۆیەکانی تێ گەیشتم. پیاوێکی دینیی کورد، (شێخ سەعید)، ڕێبەرایەتیی ڕاپەڕینی کوردەکانی کردبوو، ڕووبەڕووی لەشکری تورک بووبووەوە و لە ئاکامدا تێک شکابوو. ئیدی، ئەو مامەی باوکی منیش، وەک هەموو سەرۆک عەشیرەتە کوردەکانی تر، بەناچاری ڕێگەی تاراوگەی گرتبووە بەر. ئەو پیاوێکی ڕێکپۆشی بە شەخسیەت بوو، پایەدار، ردێنسپی. زۆر بەباشی بەهەردوو زمانی کوردی و تورکی قسەی دەکرد، بە شەوکەتێکەوە. شایەری عەشیرەتەکەشی هەر لەگەڵ ئەودا هاتبوو. تا بەرەبەیان لاوک و داستانی لەبارەی "هەرەسهێنانەکان" دەگێڕایەوە، لەبارەی شەڕ و شۆڕەکانی رابردوو؛ ئەو لاوژە و داستان و لاوکانەی کە قارەمانەکانیان بە گژ عێراقی و ئێرانییەکاندا چووبوون. بە دوور و درێژی بەیتی بەسەر کردەوە بەرزەکانی مامماد هەڵدەگوت، بەسەر جەردە بەشەرەفەکان، بەسەر خاڵەکەم کە لە شەڕ کوژرابوو... پێیان دەگوت: "دەنگبێژ"، کە بە کوردی دەکاتە "Dengbej».

یەشار کەمال هەروەها دەڵێ: «تەمەنم هەشت ساڵان بوو، لاوکبێژی کورد، عەبدال مووسا، جارێکیان داستانێکی بە کوردی لەبارەی چقوورئاوا بۆ گێڕامەوە، کە دەچووەوە سەر داستانەکانی داستانبێژی کورد عەبدال زەینەکی. ناواخنی ئەو داستانە بە شان و باڵی (محەمەد پاشای سوورەملی)، فەرمانڕەوای گەورەی کوردی هەڵدەدا، کە کاتی خۆی بەخۆی و سوارچاکەکانیەوە رژابوونە ئەو دەشتە بۆ ئەوەی شەڕ لەگەڵ فەرمانڕەوای تورکمانەکانی قۆزان ئۆغڵوو Kozanoglu بکات».

ماوەیەکی زۆر دین، ماوەیەکی تریش ڕۆمانسیزم و پاشان ناسیونالیزم و هەستی نیشتمانپەروەری سەرچاوەی نەشونمای مۆسیقا و گۆرانیی کوردی بوون. ئەدی ئەمڕۆ؟

بێگومان ئەمڕۆ هەقی خۆمانە (پێویستیشە) بپرسین: دوای دین و سیاسەت و عاتیفە، ئەمڕۆ چی بکەینە ڕەگ و ڕیشەی مۆسیقا و گۆرانیمان؟ ئایا مۆسیقای ئەمڕۆمان پێویستە لە چ سەرچاوەیەکەوە ئاو بخواتەوە؟

# ڕەخنەگرتن
# لە مۆسیقای کوردیی ئەمڕۆ



مۆسیقا گەلێک جار بۆ وەدیهێنانی مەبەستە سیاسییەکانی دەوڵەت بەکار هاتووە: کاتێک پاشا بڕیارێکی دەرکردووە و ویستوویەتی بڕیارەکە بۆ خەڵک بخوێندرێتەوە، پێش خوێندنەوەی فەرمانەکە بە تەپڵ و مۆسیقا خەڵکیان ئاگەدار کردووەتەوە ئنجا فەرمانەکەیان خوێندووەتەوە. دەوڵەتی عوسمانی هەموو ڕۆژانی دووشەمووان لە قەڵاتی هەولێر مارشی سەربازیی خۆی بۆ خەڵک لێ داوە و خەڵکی لە هەبوونی دەسەڵاتی خۆی بەسەر شاردا ئاگەدار کردووەتەوە.

(تحية العلم) واتە (سڵاو لە ئاڵا)ی ئەمڕۆی قوتابخانە سەرەتاییەکانمان، کە لەگەڵ گوتنەوەی «سروودە نیشتمانییەکانمان» هاوئاهەنگ و هاوکات بەڕێوە دەچن، پاشماوە و یادگارییەکانی هەمان ڕەهەندی سیاسی و ئایدیۆلۆجیکی مۆسیقان: کە چۆن موزیک و گۆرانی لە پێناو بەرژەوەندییە سیاسی و ئامانجە دەوڵەتییەکاندا بەکار هاتوون و دێن.

لە ئەورووپاش، بەهەمان شێوە، لە کۆتاییی سەدەکانی ناوەڕاستدا کڵێسا گەیشتبووە ئەو قەناعەتەی کە گۆرانی و مۆسیقا پێویستە دەربڕی تەنیا ئەو دنیا و بەهەشت بێت؛ نابێ باس لە برسییەتی و دەنگەدەنگەکانی ئەم دنیایەی ئەمڕۆ بکات. پیاوانی کڵێسا دەیانگوت ئەم جۆرە مۆسیقا و گۆرانییە دنیاییانە «دەستی شەیتان»ی تێدایە.

لە ساڵی ١٤٠٢ ئەنجوومەنی عەوامی ئینگلتەرا بڕیارێکی دەرکرد کە «پێویستە چی تر ڕێگە نەدرێتە هیچ گۆرانیبێژی بەرەڵا و مۆسیقاژەنێکی سەر شەقامەکانی وێڵز؛ کە کردوویانەتە خوو شانۆنامە و کلوونبازی بۆ خەڵک پێشکێش دەکەن. ئەمەش چونکە هەر ئەمانەن لە پاڵ درۆزن و جادووگەر و غەیبگۆکان بوونەتە مایەی ئاژاوە بۆ خەڵکی وێڵز».

مێژووی مۆسیقا، لە زۆر وڵاتان و لە گەلێک سەردەمدا – بەمڕۆشەوە – بریتی بووە لە مێژووی خراپ بەکارهێنانی مۆسیقا لەلایەن دەوڵەت و دەستەوتاقمە ڕیاکارە کۆمەڵایەتی و سیاسی و دینی و داموودەزگاییە ڕووکەشەکانەوە کە ویستوویانە مۆسیقا ببێتە ئامرازێکی خزمەتگەیاندن بە

بەرژەوەندییەکانی خۆیان، هەندێکیشیان تەنیا بۆ پارە پەیداکردن (لە کارگەکاندا مۆسیقا بۆ کرێکاران لێ دەدەن بۆ ئەوەی هەست بەماندوویی نەکەن، گورجوگۆڵتر، زیاتر و باشتر کار بکەن). ئیتر ئەمە هەر لە سوودوەرگرتن لە مۆسیقا لەلایەن دەوڵەتە دینی و شۆڤێنیست و فاشیست و نازییەکانەوە تا دەگاتە (مەوطنی، مەوطنی..) واتە سروودە نەتەوەییەکانی دەوڵەتی عێراق و کارە تەبلیغاتییەکانی تری دەوڵەتانی تری فاشیستی ئەمڕۆ.

بەئاراستەی دژی دەوڵەتیشەوە، لە زۆربەی وڵاتەکانی ئەمڕۆدا، مۆسیقا لە بەستێنی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا ڕۆڵێکی ترسناکی هەبووە و هەیە. تەنانەت گەلێک جاران لەلایەن دەوڵەتەوە قەدەغە کراوە و ڕێگەی لێ گیراوە.

پاپا، لویسی دوازدەم، بەپێی فرمانێک کە لە ڕۆما لە ماوەی سالانی (١٨٤٠– ١٨٤٩) پیادە دەکرا ئەمری دابوو: (هەر ئەکتەر و مۆسیقارٍ و هونەرمەندێک ئەگەر بە وشەیەک و جووڵەیەکی ناقۆڵاش لە تێکستە سانسۆرکراوەکەی پێشتر ڕەزامەندیی لەسەر دراوە لابدات، پێنج ساڵ زیندان دەکرێ. هەر کەسێکیش چەپڵە بۆ ئەم دەرچوون لە تێکستە لێ بدات ئەوا ئەویش دوو تا پێنج مانگ حەپس دەکرێ).

لە سەدەی بیستەمیشدا (گۆرانیبێژی شۆڕشگێڕی شیلی، ڤیکتۆر گارا، لەلایەن دەوڵەتەوە پەنجەکانی بڕانەوە. شڤانپەروەری خۆمان، لە هەر چوار وڵاتی تورکیا و عێراق و ئێران و سووریادا سەدان خەڵکی لەسەر ئیعدام کرا. پۆڵ ڕۆپسۆنی ئەفریقاییش بەهەمان شێوە. ژن لە ئێرانی ئەمڕۆ قەدەغەیە گۆرانی بڵێ؛ ئەو گۆرانییانەی پیاویش دەیانڵێن سنووری سووریان بۆ دانراوە).

بەم شێوەیە، مۆسیقا لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەملاوە، وردە وردە، ناچار، خۆی لە ناو واقیعێکی جەنجاڵی ئەوتۆ دۆزییەوە: بێ وێنە، هەرگیز پێشتر ئەمەی بەچاوی خۆیەوە نەدیبوو.

لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەملاوە، ئەو دەوڵەتانەی کوردیان بەفێڵی

هاووڵاتیبوونی کورد لە ناو «عێراق» و «تورکیا» و «ئێران» و «سووریا»دا لە ژێر دەستی خۆیاندا زیندان کردبوو، وەک دەبینین تا ئەمڕۆش، چنگ و چڕنووکە خوێناوییەکانی خۆیان، لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا، هێند توندوتیژ، هێند داپلۆسێن بەناو کولتوور و ڕۆحی نەتەوەی کورددا ڕۆ کردووە تا ڕادەی ئەوەی کە کورد تاکو ئەمڕۆش (بەهۆی ژێردەستەیی نەتەوەییەوە) تەنیا سەرقاڵی « نیشتمانپەروەری» و «عەشقی مەم و زینانە» بێت و بەهیچ شێوەیەک نەتوانێت قۆناغی لیریک تێ بپەڕێنێ، نەتوانێت ئەو قۆناغە ڕۆمانسییەی موزیک و گۆرانی، واتە ئەو قۆناغە باوە سەپاوە سواوەی خۆی کە زیاتر لە هەشتا ساڵە هەر دەیڵێت و دەیجوێت و دەیڵێتەوە، تێ بپەڕێنێ.

ئاماژەمان بەمە دا کە چۆن لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە سروودەکانی زێوەر و پیرەمێرد و بێکەس تا دەگاتە (ئەی ڕەقیب)ی دڵدار، پاشانیش گۆرانییە نەتەوەپەروەرییەکانی وەک کاوێس ئاغا و ڕەفیق چالاک و تاهیر تۆفیق، لەباری ڕۆمانسیشەوە چەندان سترانبێژی وەک مریەم خان و عەلی ئەسغەری کوردستانی و گوڵبەهار و نەسرین شێروانی و تا دەگاتە باکووری، سەریان هەڵدا.

ئەم قۆناغە لیریکە (ڕۆمانسیزم و نیشتمانپەروەری) بۆ ئەو زەمانەی سەرەتای سەدەی بیستەم تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەمیش بە کۆن و خراپ حسێبی بۆ ناکرێ، قەیناکە با بڵێین تا کۆتاییی ساڵانی هەشتاکانیش پێویست بوو. بەڵام ئەدی بۆ ئەمڕۆ؟ ئەمڕۆ هەمان ئەو زەمانە ڕابردووەیە؟

لە بەستێنی موزیکی نەتەوەباوەڕیدا تایەر تۆفیق هەمان ناوەرۆکی کاوێس ئاغای هەبوو بەڵام بەشێوەیەکی تازەتر. شڤانپەروەر هەمان ئایدیۆلۆجیای تاهیر تۆفیقە بەڵام بە تەکنۆلۆژیایەکی تازەتر و بەشێوازێکی تر. تاکو ئەمڕۆش نەجمەدین غولامی و هاوڕێکانی.. لەسەر هەمان ڕیتم و ناوەرۆک دەڕۆن.

لە بەستێنی موزیکی ڕۆمانسیشدا (ئەوینی دنیایی و هەڵدان بەسەر ئافرەتدا) نەسلی فوئاد ئەحمەد هەمان ناوەرۆکی نەوەی گۆرانیبێژەکانی سەردەمی عەلی مەردان بوو بەڵام بەشێوەیەکی تازەتر. نەوەی حەسەن

گەرمیانی هەمان لیریکای پێشووی نەسلی حەمەی ماملێیە بەڵام بە تەکنۆلۆجیایەکی تازەتر و بەشێوازێکی تر. تاکو ئەمڕۆش زەکەریا و هاوڕێکانی.. لەسەر هەمان ریتم و ناوەرۆک دەڕۆن.

کورد، دوور لە تەکنۆلۆجیا و زانستی موزیک، تەنیا گۆرانیبێژ یان گۆیندەی میللیی هەبووە. دواکەوتنی تەکنیکی مۆسیقا هەروەها نەبوونی مۆسیقارِ (نەبوونی مۆسیقاناس و مۆسیقاژەنی وەک مۆزارت و هایدن و سیمفۆنیاژەنەکانی تر لە ناو کورددا) وای کردووە کە تەرازووی داهێنان لە گۆرانی و مۆسیقای کوردیدا بریتی بێت تەنیا لە وشە.

لەلایەکی تریشەوە، دەربڕینی وشە، لە ناو گۆرانیی کوردیدا – وەک ئاماژەمان پێ دا تاکو ئەمڕۆش هەر – تەنیا لیریک (دەربڕینی ڕۆمانسیزم و هەندێ جاریش نەتەوەیی بووە)؛ بیر وەک مەعریفە و داینەمۆیەکی خوڵقێن بۆ دەربڕینی ژیانی مۆدێرن، لە ناو گۆرانیی کوردیدا بەپەڕاوێز خراوە.

لە ئەوروپا لە کۆتاییی سەدەی هەژدەم بەملاوەیەوە کە وردە وردە دەربڕینی بیر، بەیانکردنی ئەندێشەی ناڕەزایی و یاخیبوون لە ڕێگەی مۆسیقاوە، لە ناو هونەری مۆسیقادا دەست پێ دەکا. ئەگەر داهێنانی ئۆپێرا یاخیبوونێک بووبێت دژی دەسەڵاتی کڵێسا، ئەوا گەشەسەندنی مۆسیقا لە کۆتاییی سەرەتای سەدەی هەژدەمدا وەک یاخیبوونێک دژی سانسۆری ئۆپێرا لەلایەن دەسەڵاتەوە دێتە ئارا.

مۆسیقای فرانتس ژۆزێف هایدن (١٧٣٢– ١٨٠٩) پێوەندییەکی زۆری بە ژیانی جووتیارەکانەوە هەبوو، میلۆدی و ئیقاعی ژیانی جووتیارانی خستە ناو مۆسیقاوە. بۆیە لەلایەن دەسەڵات و دەرەبەگەکانەوە تۆمەتبار کرا بەوەی کە هایدن «هونەری جیدی و هونەری کۆمێدی تێکەڵاوی یەکتر دەکات».

وڵفگانگ ئامادیۆس مۆزارت (١٧٥٦– ١٧٩١)، لەو ئۆپێرایانەی لە کۆتاییی ژیانیدا نووسینی، بیری خۆی دژی ئەو چوارچێوە ناشیرینەی دەسەڵات دەربڕی کە لە سەردەمی ئەودا تەنگی بە مرۆڤ هەڵچنیبوو. ماوەیەکیش ڕووی

کـردە سـازدانی ئۆپێـرای کـۆمـێـدی بۆ ئەوەی خـەڵک بەرامـبـەر دەسـەڵات بەپێکەنین بهێنێ.

لۆدویک ڤـۆن بتـهـۆڤن (بـۆن ١٧٧٠- ڤـیـەننا ١٨٢٧) دەیویست بەڕاسـتـی مـۆسیقـا بکاتە جـەمـاوەری و بیبـاتە ناو گـەل؛ بۆیە بەهرەی لە ئاوازە مـیللی و ناڵینە جـەمـاوەرییەکـان وەردەگرت. گـوێنەدانی تاک بـە کۆمـەڵ تیـمـێکی دیاری مـۆسـیـقـای بتـهـۆڤنە. ئـەمـەش لەسـەر بنـچـینەی باوەڕی بتـهـۆڤن بە ریـالیـزم: چونکە ئەو، گرفت و داخوازییـەکانی مرۆڤی سـەردەمی، بەشێوەیەکی جەسوور و چاونەترسـانە دەردەبڕی. ریالیـزمی بتـهـۆڤن دەربڕیـنی دەنگەکـانی باڵندە و هەور و مـەل و کـانیـاو نییـە بەڵکو بریتییـە لە دەربڕینی ڕووخسـاری مـرۆڤ و کۆمـەڵگەکەی خۆی، جـەسـوورانە، لە ڕێگەی دەنگە هـاوچـەرخەکـانی ڕۆژگـاری خۆی.

دراما، یان درامیبوونی مۆسیقایی، لای بتهۆڤن خاڵێکی تری هەڵبوێردراوە. ریالیزمی بتـهۆڤن لەمەشـەوە دێ کە ناوبراو کـاری تەنیاوتەنیا لەسـەر جووڵە و درامـا و ملـمـلانێ و تێکۆشـان و جـەنگ و شـیتـەڵکردنەوەی تـراجیـدیای ژیانی نوێ کـردووە. لە ناو بەرهەمـەکـانی ناوبراودا زیهنێکی گـەورە تەمـاشـای ژیانی سەردەمی خۆی کردووە تا بتوانێ ئەو مۆسیقایە بەرهـەم بهێنێ.

گـوێگر دەپرسێ: چ ملـمـلانێیـەکی کۆمـەڵایەتی، چ زۆرانبـازییـەکی تاک دژی ڕەمـزەکـانـی دەسـەڵات، یان چ ناهـەمـواری و کێـشـەگـەلێکی هـاوچەرخ بوونەتە هۆی سـەرهـەڵدانی ئەم هـەموو دەنگە دانسقە و میلۆدییە تازانە لای بتهۆڤن؟

لەسـەر بنـچـینەی ئەم بـەراوردکـردنە خـێـرایەوە، منێک کـە نازانم تـەنانەت دمبک و دەفیش لێ بدەم، ئەوەندە شـعوورەم هەیە هـەست بە وێرانەیی گۆرانی و مۆسیقای کوردی بکەم و بڵێم:

بەتێگەیشـتنی من؛ موزیک و گۆرانیی کوردیی ئەمڕۆ نەیتـوانیوە بزانێ چۆن ڕیتمی تازەی ژیانی نوێ و ئـەزموونە هاوچـەرخەکـانی تەعبیـر بکات، نەیزانیوە بتوانێ چۆن گرفتەکانی ئەمڕۆی مرۆڤی کورد دەرببڕێت.

ئەو هەموو جەنگە یەک لە دوای یەکە، ئەو هەموو برسییەتییە، ئەو هەموو تراجیدیا کۆمەڵایەتییە، ئەم هەموو تەڵاق و لێکتر جودابوونەوەیە، ئەو هەموو خۆپێشاندانە، ئەو هەموو گەندەڵی و تاریکی و نەخۆشی و جەنجاڵییە تێکچڕژاوەی سەردەمی نوێ... هیچیان تەرجومە نەکراونەتە سەر زمانی موزیک لە کوردستانی ئەمڕۆماندا.

دەنگە هاوچەرخەکان، ڕەنگە تازە دەرکەوتووەکان (واتە ئەو دەنگە نامۆ و تازانەی لە شارستانییەتی نوێدا دەکەونە بەرگوێمان، ئەو وێنە و دیمەنە تازە دەرکەوتووانەی لە قووڵاییی شارستانییەتە تازەکەوە ڕۆحمان ڕنەک دەدەن) کە پێویست بوو لای مۆسیقاری کورد و گۆرانیبێژی کورد وەربگێڕدرێنە سەر فیکر، بکرێن بە ڕستەی مۆسیقاییی هاوچەرخ؛ کەچی هەموویان تەنیا لە ناو سنگ و گەرووی خەڵکە ماتەمینبارە غەیرە هونەرمەندەکاندا قەتیس ماون.

ئەو نیمچە سەربەخۆییەی لە حکوومەتی هەرێمی کوردستانی عێراقدا هەمانە، ڕاشکاوانە دەڵێم، پێویستە لە دوو لاوە سوودی لێ ببینین:

١- دۆخێکی نیمچە دیموکراسی و لیبراڵ لە ناو هەرێمدا هاتووەتە پێشەوە کە هونەرمەندی کورد بتوانێ لەو قۆناغە لیریکە سادە و ساکار و سواوەی هەشتا ساڵی ڕابردوو ڕزگاری ببێت و مۆسیقای کوردی بگەیەنێتە هونەری مۆدێرن: ئاستێکی لێوەشاوەی مرۆڤی سەردەم.

٢- لە ڕێگەی گفتوگۆ و ڕادەربڕین و تەنزیراتەوە، پێویستە مۆسیقا لە ئاستێکی ئێستێتیکی و فەلسەفیدا لێی بکۆڵدرێتەوە، وەک داهێنان و بەهایەکی ئێستێتیک؛ نەک تەنیا وەک چالاکییەکی سادە و ساکاری نەتەوەیی، یان وەک باوە بڵێین «شانازیی نەتەوەیی» لەناو فیستیڤاڵەکاندا.

لە سەرتاپای مێدیا و دەزگا کولتوورییەکاندا پرسیار لەبارەی مادەی (١٤٠) و (٧٣٠) و خۆسووتاندنی ژنان و کۆمەڵگەی مەدەنی و فرەژنی دەکرێت، کەچی هیچ یەکێکیان دۆخی بەدبەختی مۆسیقای کوردییان نەکردووەتە مانشێتێک.

حکوومەت (ئەگەر حکوومەتی هەرێمی خۆمان یان حکوومەتە

داگیرکەرەکانی کوردستان)، هەریەکەیان بەشێوەیەک، کاتێ دەستی خستە ناو هونەرەوە، هەمان شێرپەنجەیە و هەمان مەترسیی هەیە.

باندەستی خراپ و نێگەتیڤانەی حکوومەت و حزب (حکوومەتی کۆلۆنیالیست بەشێوەیەک، حکوومەتی ناسیوونالیست بەشێوەیەکی تر) بەسەر مۆسیقا و گۆرانییەوە، ناوەرۆکی مۆسیقا و بەهای گۆرانی بەرەو هەڵدێری سادەیی و ساویلکەیی و خەرابات لێژ دەکەنەوە.

ئەمەش چونکە حکوومەت (هەم کۆلۆنیالیست و هەم حکوومەتی ناسیونالیستیش) هەردووکیان ئایدیۆلۆجیست و سوودخواز، هەریەکەیان بەشێوەیەک، تەنیا داواکاری ئایدیۆلۆجیا و مەعنان، مەعنای ڕاستەوخۆ لەناو مۆسیقادا: مەعنایەک کە لە بەرژەوەندیی خۆیاندا و بەدڵ و داوی خۆیان و لە ئاستی تێگەیشتنی خۆیاندا بێت و بەس.

فریدریک نیتشەی فەیلەسووفی ئەڵمان (ڕامانە ناوەختەکان ١٨٧٦) کە زۆری لەبارەی مۆسیقای ڤاگنەرەوە نووسیوە، پێی وایە: بیرکردنەوەی مەعناخواز جۆرێکە لە «دابەزین» لە پلەیەکی باڵای خۆتەوە بەرەو خوارەوە.

ئەم مەعناخوازییە ڕاستەوخۆیە، کە زۆربەی جار خۆی لە سوودخوازی و کەڵک گەیاندن بە ئامانجە سیاسییەکانیان نزیک دەخاتەوە؛ نیشانەیەکی زۆر زەقی ساویلکەیی و زەوقسزییە لە ناو توێژی فەرمانڕەوا و دەسەڵاتداراندا.

ئەم مەعناخوازییە ڕووکەش و سوودخواز و ساویلکانەیە، تەنانەت لە بەستێنەکانی شیعر و مۆنیمۆنت و نیگارکێشی و شانۆ و لە هەموو هونەرەکانی تریشدا باڵ بەسەر ئەو کۆمەڵگەیانەدا ڕادەکێشێت کە حکوومەت تێیدا بەسەر هونەر و هونەرمەندانەوە فەرمانڕەوایە؛ لە ئەنجامیشدا مۆسیقا دادەبەزێنێتە ئاستی سفری ناو پیسترین چڵپاوەکانەوە.

ئەو شەڕە براکوژییەی، کە ئاگرهەڵگیرسێنەکانی، هەریەکەیان بەناوی حکوومەت و کوردایەتییەوە، بۆ ماوەی زیاتر لە پێنج ساڵ هەوڵیان دەدا هەر لایەکیان جۆرە سروودێکی نیشتمانیی خۆی و جۆرە گۆرانییەکی تایبەتی خۆی بەناوی هونەرەوە لە کوردستان بڵاو بکاتەوە.. زەنگێکی خەتەرە بۆ

بەڕاستگەڕانی ئەم قسانەی هەر لە ئێستاوە لێرە دەیانکەم.

هەروەها پەیداکردنی ئەو دەسەڵاتە حزبایەتییەش کە هەر یەکێک لە ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن و دەزگا مۆسیقاییەکان و بەتایبەتیش سەتەلایتە کوردییەکان، تاقم تاقم، لە شێوەی باند و «کۆمپانیای» جیاجیا، زۆر جارانیش لەگەڵ یەکتر دژ و ناکۆک، کە بە ناوی حزبەوە یان بەناوی کوردایەتییەوە، چنگیان ئەمڕۆ ڕۆ کردووەتە ناو دەمارەکانی وزەی گۆرانی و مۆسیقار و هونەرمەندەکانەوە، دیسان ئەویش بەڵگە و زەنگێکی خەتەری ترە بۆ بەرەوانیشاندانی ئەو تێزە زیاد لە لزووم بەدیهی و ڕاستەی کە لێرەدا ویستم، تەنیا لە پێناو مانەوەی مۆسیقای ڕەسەندا، دووپاتی بکەمەوە.

هیچ ئۆپۆزیسیۆنباوەڕییەک لە ناو ئەم وتارەمدا نییە، من تەنیا دەمەوێ ئاماژە بە ڕاستییەک بدەم: کاتێ سیاسەتبازی و نەتەوەپەروەری (بەتایبەتیش وەختێ ئەو نەتەوەیە خۆی گەیشتبێتە حاکمیەت) خۆی بخزێنێتە ناو مۆسیقاوە، ئیتر ئەو مۆسیقایە تەنیا تا ئەو شوێنە بڕستی دەمێنی کە لەوێدا پێی گەیشتووە: ناتوانێ لەوێ زیاتر بۆ هیچ جێگەیەکی تر و بۆ هیچ زەمانێکی تر ببزوێ. هەر زوو سەردەمێکیش دادێ کە گۆرانییەکانی وەک (زێڕە.. زێڕە) و سروودەکانی "داود القیسی" دەبنە جێگەی قەشمەجاری لەلایەن خودی ئەو خەڵکە ڕەشۆکەی کە زەمانێکی زۆر بوو هەر بۆ خۆشی چەپڵەی بۆیان لێ دەدا.

واز لەم ڕاستییە زیاد لە پێویست بەدیهییانە دەهێنم و دەچمە ناو هەندێ مەسەلەی تایبەت بە تەکنیک و خودی هونەری مۆسیقا خۆیەوە، بۆ ئەوەی بتوانم ئەو مۆتەکەیەی ڕۆ چووەتە ناو ڕۆحی مۆسیقا و گۆرانییەکانمانەوە، هیچ نەبێ بتوانم دەسنیشانی بکەم: لە کوێیە و بۆ کوێ دەڕوا و زیانی چییە: مۆتەکەی لیریک (ڕۆمانسیزم و نیشتمانپەروەری)؛ لەمەش خراپتر ئەو ڕۆشنبیرییە گەمژە و ساویلکەیەی کە ئەمڕۆ بەدەوریدا دەسووڕێتەوە و کۆمەکی دەکا و جڵەوی هونەرمەندان بۆ ئەو ئاراستەیە ڕادەکێشێ کە خۆی دەیەوێ.

# گەڕان بەدوای

# مانای هونەر مانای مۆسیقا



"مرۆڤ بە سروشتی خۆی
وەک ژیان خۆی درۆزنە، ژیان بێ مانایە،
هونەرمەند مانایەکی شەخسیی خۆی بۆ ژیان دەدۆزێتەوە و
مانایەکی تاکرەو دەبەخشێتە ژیان".
فرێدریک نیتشە.

فەیلەسووفی مۆسیقاناس، ئەندرۆ بۆوی A. Bowie پێی وایە مۆسیقا لە ڕووی زمانەوە (واتە کە ڕاستەوخۆ زمانێکی هەبێ) هیچ ڕەهەندێکی واتایی (واتاناسییی) نییە. گەلێک مۆسیقاناس و جوانیناسی تریش هەمان ڕایان هەیە. ئەمە ڕاست نییە.

ئەندرۆ بۆوی پێی وایە کە دەربڕینە مۆسیقاییەکان ناگۆڕێنە سەر پێشبینیی وێنەداری ئەوتۆ کە ئێمە بەهۆی ئەو وێنە پێشبینیکراوانەوە بتوانین لە شێوەی زمانێک یان لە ڕێگەی زمانەوە تێیان بگەین. بەڵام ئەندرۆ بۆوی وا دەبینێ کە مۆسیقا لەگەڵ ئەمەش جۆرێک لە «مانا»ی تایبەت بە خۆی هەیە، جۆرە مانایەک کە نۆڤالیس و شلینگ ئەو مانایەی مۆسیقایان لە ناو (ریتم)دا دۆزیوەتەوە. هەر ڕیتمێک مانایەکی لە خۆیدا هەڵگرتووە. شاعیرێک لە شیعری (بۆبەلات)دا دەڵێ:

لەلای ئێمە
ژیان ژەنگی ژەهری ژانی ژیاری تێدا دەهەژێ
زریان زیپکەی زاری زەماوەندی زیقنی زەمانی تێدا دەزێ
رووبار ریشی رازی رێویی لەڕی ڕێیانی تیا دەلەوەڕێ
چاو چەڵتووکی چیۆرمەی چەقی چەتوونی چەقەلانی تێ دەچەقێ...

من پێم وایە شاعیر لە هەموو کەسێک زیاتر، مەبەستم لە هەموو فەیلەسووفێک باشتر، لە مانای مۆسیقا تێ دەگات و باوەڕی بەوە هەیە کە مۆسیقا بەڕاستی مانای هەیە: چونکە شاعیر بۆ خۆی کاری ئەوەیە کە لە

ڕێگەی مۆسیقای وشەوە مانا دروست بکا، لە ڕێگەی ئاوازەوە مانای ڕستەیەک لە مانای ڕستەیەکی تر جودا بکاتەوە و لە هەمان کاتدا مۆسیقای هەر یەکێک لە وشەکان پێکەوە هاوئاهەنگ گرێ بداتەوە و لە ڕێگەی بەریەکترکەوتنی مۆسیقاییی وشەکانەوە مانایەک دروست بکات.

پێوەندیی نێوان حاڵەت و مانا لە شیعریشدا زۆر جێگەی بایەخ پێدانە. شاعیری ناوداری ئەڵمان، نۆڤالیس، کاتێ قسەی لەسەر شیعر دەکرد، مۆسیقای هەرگیز لە قسە جودا نەدەکردەوە: شیعر و مۆسیقا لای نۆڤالیس هێندە توندوتۆڵ یەکانگیرن.

لە شیعرە حەماسییەکانی فیردەوسیدا ئێمە بەهۆی وەزن و ریتمی وشەکانەوە پەی بەوە دەبەین کە فیردەوسی دەیەوێ حەماسییانە قسەمان لەگەڵ بکات و بمانخاتە ناو مانایەکی حەماسییەوە. لە شیعرەکانی فرووغی فەروخزادیشدا دیسان ئێمە بەهۆی ریتم و ئاوازی ڕستە درێژەکانیەوە دڵمان توند دەبێت و تێ دەگەین کە فرووغزادی شاعیر چ ژنێکی بەگازاندە و نائومێدە لە ژیاندا. با لەم شیعرەی ئەحمەد هەردی ورد بینەوە:

با لە دەستی
ژینی پەستی
شار و دێ
ڕاکەین و ڕوو بکەینە چۆڵ و هەردێ..

ئەم مۆسیقا وەزن سووکە بۆ ئەوە دروست کراوە کە دڵت خۆش بکات و وات لێ بکا لەگەڵی تۆش بکەویتە لەنجە و خرۆشەوە. ئاشکرایە ئەمە مۆسیقای ڕۆمانسییە و لەگەڵ مۆسیقای حەماسەبەخشی «ئەی ڕەقیب» فەرقی هەیە؛ بەڵام هەردووکیان، شیعرەکەی هەردی یان سروودەکەی دڵدار، ئەگەر وشەکانیشیان لێ لابدەیت بێگومان هەمان مانای خۆیان دەتوانن بگەیەنن. (ئەگەر گوێی خۆت لە وشەکانیان کەڕ بکەیت و تەنیا گوێ بۆ ئاوازەکەیان هەڵبخەیت، ڕاستیی ئەم سەرنجەت بۆ دەردەکەوێ).

خۆ زۆر جاران لە نووسینی ئاسایی و سادەشدا تەنیا بە پاش و پێشکردنی وشـــەیەک یان تەنانەت هەندێ جـــار بەدانانی نوقـــتـــەیەک یان بەلابردنی فاریزەیەک مانایەکی جیاواز دروست دەبێ:

«لێبووردن! مەحاڵە لەسێدارە بدرێ».

«لێبووردن مەحاڵە. لەسێدارە بدرێ!».

بەم شـــێـــوەیە، چارەنووسی ئەو کـــەســـەی خـــەریکە لەســـێـــدارە دەدرێ، تەماشاکەن بە مۆسیقا و ئاوازی قسەکردنەوە بەندە، نەک بە وشەکانەوە.

لە هەمووی گرینگتریش بۆ سەلماندنی ڕۆڵی گرینگی میلۆدی لە بەستێنی داهێناندا ئەوەیە کە (لە شیعر، لە نیگار، لە شانۆ، بەتایبەتیش لە هونەری مۆسیقادا) تەنانەت خودی بێدەنگی- خۆیشی (لە هونەری شێوەکاریدا ڕووبەڕە بۆشەکان) بایەخێکی یەکلاکەرەوە و یەکجار گرینگیان هەیە. بەبێ ئەو بێدەنگییە، بەشەکانی تری کە ئاوازیان هەیە و دەنگیان لێوە دێ، ناتوانن هیچ بکەن و هیچ دەرببڕن. بەواتایەکی تر، ئەگەر ئەو بێدەنگییە نەمێنێت و دەنگێک بێتە جێگەیەوە، بێگومان بەرهەمەکە ناساز دەبێت و تێک دەچێ. بە مانایەکی تر؛ ئەو بەرهەمە هونەرییە (ئەگەر لە شیعر یان لە شانۆ یان لە مۆسیقا) پێویستی بەو بێدەنگییە هەیە لەو شوێنەدا. ئەمەش چونکە نۆتەکانی ناو پارچە مۆسیقاکە پێویستییان بە نۆتەی تر هەیە بۆ ئەوەی ببنە پارچە مۆسیقایەکی تەواو؛ لە ناو ئەو نۆتانەدا (بێدەنگی) نۆتەیەکە.

ناوەرۆک هەمیشە بە میلۆدی و فۆرمی گوتنەوە بەندە نەک بە ماناوە. بەهای هونەری بە شێواز و شێوەی دەربڕین و تەکنیکەوە بەندە نەک بە وشەکانەوە.

لەبارەی بلیمەتیی مۆسیقای ڤاگنەرەوە، نیتشە دەڵێ: «ڤاگنەر زمان دەخاتە حاڵەتگەلێکی ئەوتۆ کە تۆ ناتوانیت بیر لە هیچ ئاستێکی ماناییان بکەیتەوە».

زمان بەپێی ڕێککەوتنێک بەڕێوە دەچێ، عەینەن وەک مەکینەیەک و وەک سیستەمێکی دیسیپلینکراو؛ بەڵام مۆسیقا هەست و نەستە ڕاستەقینە و باڵ نەکراوە ئازادەکان بەیان دەکا کە هیچ دیسیپلینێک ناتوانێ کۆتیان بکا.



لێرەوە سەرنجێکی تری خۆم تۆمار دەکەم و دەڵێم: زمانی ڕاستەقینەی مۆسیقا، بەپێی تێگەیشتن و پێوەرەکانی مرۆڤی مۆدێرن، ڕیتم و ئاوازە نەک وشەکان: ئەو وشە بەباق و بریقانەی بۆ «نیشتمان» و «نەتەوە» و «حزب» و «حکوومەت» دەوترێن، هەروەها ئەو وشە «ڕۆمانسیانەی» کە بەناوی خۆشەویستییەوە هەڵدەدرێنە ئاسمان و گەلێک جاران مایەی قەشمەری پێ کردنن، وا لە مرۆڤ دەکەن بڵێن: ئەو گۆرانیبێژانە بۆ خۆشیان درۆ لەگەڵ خۆیان و سۆزی خۆیان دەکەن.

جوانیناسی ئەڵمان، فریدریک هیگڵ، مۆسیقا، وەک هونەرەکانی تر، بە جیلوەی (ڕۆحی ڕەها) دەزانێ کە (ڕاستی) دەردەبڕێ. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پێی وایە کە مۆسیقا پێویستە سەربەخۆیی خۆی بپارێزێت و نابێ خۆی بخاتە ژێر خزمەتی ناوەرۆکێک کە لەلایەن مەتنێکەوە خراوەتە ئەستۆی.

ئایا مۆسیقا وشەی بۆ بنووسرێتەوە (تەئلیفی مۆسیقی)، یان وشە مۆسیقای بۆ دابندرێت (تلحین)؟ پرسیارەکە بەشێوەیەکی تر: لە سەرەتادا بێین ئاواز دابنێین ئنجا شیعرێکی بۆ بنووسین یان بەپێچەوانەوە لە سەرەتادا شیعرێک بهێنین ئنجا ئاوازێکی بۆ دابنێین؟ لای ئێمە لە کوردستان وشە (واتە شیعر) مۆسیقای بۆ دادەندرێ. ئەمە هەڵەیە. چونکە زۆربەمان دەزانین ئەمە ئاواز و شێوازی دەربڕین و میلۆدییە مانا دروست دەکات نەک مانای حازربەدەست و وشەی قەبە و پفکراو بێت بتوانێ مۆسیقا دروست بکا. بەهەمان شێوە لە نیگارکێشیشدا: هێڵ و ڕەنگ و شێوە و تەکنیکی ئەوانە مانا دروست دەکا نەک بابەت و «واقیع».

ئەمەی گوتم ڕاستییەکی تریش ڕوون دەکاتەوە: بیر و مانا (چەندیش بەرز و تازە بن) بەبێ شێوازی دەربڕین و بەبێ میلۆدییەک کە هونەرمەندانە داڕێژرابن، هیچ بەهایەکیان نامێنێ: چونکە هەردەم مەترسیی ئەوە لە ئارادا هەیە کە مانا مانایەکی تری پێچەوانەی خۆی، لێکدانەوەیەکی تری دوور لە خۆی پەیدا بکا. بۆ سەلماندنی باشتری بۆچوونەکەم، قسەیەکی (ڤلادیمیر ژاکێلیۆڤیچ) دەهێنمەوە کە دەڵێ: «بوون بەبێ شێوازی بوون هیچ مانایەکی نییە».

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو زەوقسزە ساویلکانەی کە تەنیا داوای «مانا» لە هونەر دەکەن، دەپرسم: ئەدی بۆچی ئەو ماناپەرستە ساویلکانە وەختێ مانایەک دەبینن کە دژی بەرژەوەندی و دەسەڵاتی خۆیانە و دژ بە چێژی ڕەقهەڵاتووی خۆیانە، سەغڵەت دەبن؟

کەواتە، «مانا» یەک شتی موتڵەق نییە: هەزار جۆر مانا هەیە. «جیهان توانای لێکدانەوەی جۆراوجۆری لە ناو خۆیدا حەشا رداوە. – نیتشە». چ

زۆره مانا زۆره: چونکه هەموو کەسێک دەتوانێ مانایەک دروست بکا؛ بەڵام هونەر تەنیا هونەرمەند دەتوانێ دروستی بکا.

شتێکی تریش؛ هەر دەربڕینێکی مۆسیقایی ئەگەر بتوانێ لە ڕێگەی ئامراز و وزەکانی خۆیەوە ژیان یان مرۆڤ بخاتە بەدەنگهاتن و دیتن و هەژان و لەرینەوەیەک؛ ئەمە مانای وایە ئەو دەربڕینە مانایەکی هەیە (هەبووە): بۆیە توانیویەتی ئەم کارە بکا.

جگە لەمەش: ئەگەر مانا بریتی بێ لە شتێک هەستی پێ بکەیت، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە مۆسیقا ئەمەتا مانای هەیە؛ ماناکەشی ئەوەیە کە ئەمە مۆسیقایە نەک هاتوهاوار و قسەی قۆڕی بێ سەروبەر.– کە بەبۆچوونی من ئەوانیش هەر (هاتوهاوار و قسەی قۆڕیش) مانای خۆیان هەیە.

کەواتە، هەموو شتێک مانای هەیە؛ هەموو شتێک لەم گەردوونەدا مانای هەیە.

هەموو شتێک مانای هەیە، چونکە دەکەوێتە سەر ئەوەی ئێمە خۆمان چەند هۆشیارین؛ ئێمە خۆمان چۆن و چەند بڕستی جوانیناسیی ئەوەمان هەیە شتەکان لێک بدەینەوە و ڕەهەندەکانیان بناسینەوە.

هەموو شتێک مانای هەیە، چونکە ئەمە بڕستی ئێمە و توانای پێشبینیکردنی ئێمەیە کە مانا بۆ شتەکان دەدۆزێتەوە، نەک شتەکان خۆیان.

ئەمە کۆمەڵ و مرۆڤە کە مانا بۆ شتەکان و لێکدانەوەی شتەکان دەدۆزێتەوە نەک شتەکە خۆی.

شت، ڕەق و تەق، بە لەوێ داندراوی.. ڕاستە: هیچ مانایەکی نییە، بەڵام کاتێ کەسێک هەستی دەبێ و لەو شتە تێ دەگا یان لەو شتە چێژ وەردەگرێ، لەو کاتەدا ئەو شتە مانایەک پەیدا دەکا.

کەواتە دەبێ دان بەمەدا بێنین: هەر کاتێک کەسێک گوتی «ئەم شتە هیچ مانایەکی نییە». ئەمە مانای وایە ئەو کەسە خۆی هیچ ئیحساسێکی نەبووە، یان بەلای کەمەوە هەستی جوانیناسی یان توانای بیرکردنەوەی لە ژیان و

شتەکانی ژیاندا نییە.. یانیش دیارە لەوسەری هاتووەتەوە (چونکە لەگەڵ چێژ و بەرژەوەندیی ئەودا ناگونجێت و) گاڵتە بەمانای ئەو شتە دەکا!

ئەمە لەبارەی شتەکانەوە بەشێوەیەکی گشتی. ئەدی ئاخۆ کەسێک ئەگەر بڵێ «مۆسیقا هیچ مانایەکی نییە»، یان ئەگەر بڵێ «فلان تابلۆی ئەبستراکت، یان فلان مۆنیمێنت هیچ مانایەکی نییە»؛ دەبێ چ وەڵامێکی بدەینەوە؟

من لە سەرەتاوە بۆیە بە هەڵکوتانە سەر پێوەری ناسیونالیستی و ڕۆمانسی دەستم پێ کرد و ڕەخنەم لە مەترسیی ئەوە گرت کە هونەرمەند بێت بەپێی پێوەرەکانی چێژی حکوومەت و «مێگەل» و حزب و دەوڵەت داهێنان بکات: چونکە دەمزانی قسەکردن ڕامان دەکێشێتە سەر ئەوەی کە ئێستا بێم بڵێم:

زۆربەی مەسئوولەکان، بەشێوەیەکی گشتی زۆربەی ژن و پیاوانی دەسەڵات، مۆسیقایان پێ خۆشە تەنیا بۆ ئەوەی قسە لەبارەی موناسەبەتی مۆسیقا لێدانەکە (فیستیڤاڵەکە) یان لەبارەی ناوەرۆکی وشەکان و مانای گۆرانییەکە بکەن، یانیش تەنیا چونکە دەتوانن هەندێ شتی کەم کە لەبارەی ڕێسا و یاساکانی گۆرانییەوە دەیزانن بەراوردیان پێ بەیەکتر بکەن؛ بۆ ئەوەی مەعنای باشتر و ناوەرۆکی ئاشکراتر لە ناو ئەو مۆسیقایەدا بدۆزنەوە و لێکیان بدەنەوە.

هەمیشە ڕەهەندێکی واتایی لە هەر جۆرە دەربڕینێکی مۆسیقیدا هەیە، تەنانەت لە لەرینەوەی ژێیەکیشدا.

دادوەریکردنی هونەر لەسەر بنچینەی «مانا»، یان پێوانی بەهای ئیستێتیک بە تەرازووی مەعنا، لە زەوقسزی و ساویلکەییەوە سەرچاوە دەگرێ. ئەمە بەسە داهێنانێک جوان بێ.. ئیتر بۆچی دەبێ ئەو شتە جوانە مەعناشی هەبێ؟ ئێمە کاتێ کچێکی جوان، یان دیمەنێکی جوان دەبینین چ مەعنایەکیان هەیە کە ئاوها کەمەنکێشی ئێمە دەکەن و بەدیاریانەوە حەیران و سەرسام ڕادەوەستین؟

شتێکی تریش؛ ڕۆڵی کۆمەڵ لە دیاریکردنی مانا و چۆنیەتیی لێکدانەوەی مانادا هێندە بێزەوەر و نالۆجیکە کە تەنانەت دەتوانێ ئەو شتانەی ماناشیان هەیە بە «بێ مانا» لەقەڵەمیان بدا. زۆر جاران کەسێک قسەی کەسێکی تری بە دڵ نەبێ، یان ڕەفتار و هەڵوێستی کەسێکی تری بە دڵ نەبێ (بام کابرا لەسەر حەقیش بێ) پێی دەڵێ «ئەم شتانەی ئەو دەیانڵێ و دەیانکا زۆر بێ مانان».

ڕۆڵی کۆمەڵ لە دیاریکردنی مانا و چۆنیەتیی لێکدانەوەی مانادا هێندە سەخیف و نادادپەروەرانەیە کە تەنانەت دەتوانێ مانای تر و جیاواز بۆ ئەو شتانە لێک بداتەوە کە ئەسڵەن زۆر دوورە ئەو مانایەیان هەبێت کە ئەوان دەیڵێن و لێکی دەدەنەوە.

مانا هەمیشە لە ناو شێواز و فۆرمەکان خۆیاندا حەشار دراون بەڵام دەبێ ئێمە بتوانین درکیان پێ بکەین. مانا لە ناو هەموو شتێکدا هەیە ئەگەر ئێمە درکیان پێ بکەین.

بامیە، یان کفتە، لای زۆربەمان، لە یەکەمین دەرکەوتی خۆیدا هیچ مانایەکی نییە؛ بەڵام ئەگەر لەسەری ڕاوەستین و قسەیان لەبارەوە بکەین.. دەبینین کفتە پێوەندیی بە مەتبەخ و کابانی باشەوە هەیە، پێوەندیی بە دابەزینی نرخی دۆلار و مێوانداری و دەیان شتی تریشەوە هەیە؛ لەناوچوونی کفتە پێوەندیی بەکارکردنی ژن لە دەرەوەی ماڵ و ژنی مۆدێرنەوە هەیە. بامیەش هەر وا. سۆبە و کارەباش.. هەریەکەیان هەزار مانایان بۆ دەدۆزرێتەوە: ئەگەر ئینسان خۆی کەمێک خەیاڵی هەبێت و بیر بکاتەوە.

هەر کەسێک خەیاڵی نەبێ مرۆڤێکی بێ هۆش و زەوقسزی لێ دەردەچێ: لە بچویکترین ماناکانی لەرینەوەی ژێی کەمانێکیش تێ ناگا. هەر کەسێک خەیاڵی تا ئەو ڕادەیە پەروەردە نەکرابێ کە بتوانێ میلۆدی و ئاواز، یان ڕەنگ و پێکهاتە شێوەیییەکان، هەستی بلەرێننەوە، ئەوا بێگومان ناتوانین زۆری لێ بکەین لە مانای مۆسیقا (لە هونەر) تێ بگات.

هەر کەسێک خەیاڵی باڵ کرابێت و هێزی بزاوتنی نەبێ، هەرگیز ناتوانێ لە ماناکانی میلۆدی و ئاواز (یان لە فۆرمە هونەرییەکان) چێژ وەربگرێ. بۆیە ئەو کەسە هەقی خۆشیەتی (ئەگەرچی هونەرمەند بەزەییشی بەو نەوعە کەسەدا دێتەوە کە دەبینێ:) تەنیا بەدوای (وشە) و (مانا)ی حازربەدەستدا دەگەڕێ.

ئامانجی سەرەکیم لە پێکدی گرتنی ڕۆڵی (میلۆدی) و (وشە)، بەراوردکردنی ڕۆڵی (ئاواز) لەگەڵ (مانا) ئەوە بوو کە دوو ڕاستیتان وەبیر بخەمەوە:

١- دەنگ، لە چاو وشە، لە هونەری مۆسیقادا، ڕۆڵی پلەی یەکەم و لە پێشەوەتر و گرینگتری هەیە. (وەک چۆن لای شێوەکار ڕەنگ و هێڵ و فۆرم، لە چاو فیگەر و تەشریحی ئەکادیمی، ڕۆڵی پلەی یەکەم و لە پێشەوەتری هەیە).

٢- ئامانجی دووەمیشم ئەوە بوو کە وردە وردە خۆم ئامادە بکەم بۆ ئەوەی بڵێم: مۆسیقای کوردی، ئەگەر سترانبێژ یان مۆسیقارِ، بزربووی ناو لیریک و ڕۆمانسیزم، تاکو ئەمڕۆ (دەنگ) و میلۆدییان تەرجەمە نەکردووەتە سەر (فیکر)، فیکر بەواتای ڕستەی مۆسیقاییی مۆدێرن.

گۆرانیبێژ یان ئاوازدانەر، بزربووی ناو بۆنە نەتەوەییەکان و مانا ساویلکەکان، تاکو ئەمڕۆ بەشێوەیەکی هاوچەرخ دەنگیان (دەنگ: کە بچووکترین دانەی واتابەخشی مۆسیقا و گرینگترین توخمەکانی مۆسیقایە) نەگەیاندووەتە ئاستێکی ئێستێتیکی ئەوتۆی لایەق بە مرۆڤی ئەمڕۆیی، تەعبیر لە ڕیتمی ژیانی نوێ بکا.

«ڕیتمی ژیانی نوێ، دەنگ و سەدا ئەمڕۆییە هاوچەرخان، پێویستە تەرجومە بکرێنە سەر ڕستەی مۆسیقاییی مۆدێرن». مەبەستمان لەم قسەیە چییە؟

نەک تەنیا مۆسیقارِ و ئاوازدانەر بەڵکو هەر هەموومان دەزانین؛ دەنگی ئەم سەردەمەی ئێستا، واتە ئەو دەنگانەی کە لە سەردەمی ئەمڕۆماندا، لە

دەوروبەرماندا و لە ناوماندا دەیانبیستین و کارمان لێ دەکەن، فۆرمێکی تەواو جیاواز و شێوەیەکی تەواو تازەیان لە چاو دەنگەکانی سەردەمە بەسەرچووەکان هەیە: ئەو سەردەمانەی کە «جادە چۆڵ و سێبەر بوو.. کاتی بەیانی».

ئەو دەنگانەی کە لە ڕۆژگاری نوێماندا، لە دەوروبەری تازەی ئەمڕۆماندا گوێبیستیان دەبین و کارمان لێ دەکەن، کەواتە، لەسەر دەستی ئێمەی ئاوازدانەر و سترانبێژ «هیچ نەبێ چونکە تەنیا ئێمە گوێیەکی مۆسیقیمان هەیە» پێویستە ناوەرۆکێکی تەواو جیاواز لە چاو ناوەرۆکی مۆسیقاییی سەردەمەکانی ڕابردوو پەیدا بکەن. پێویستە ڕیتمی ژیانی ئەمڕۆ دەرببڕن، نەک ڕیتمی ژیانی کۆن.

ئەم قسەیە لەبارەی شاعیر و ڕۆماننووس و نیگارکێش و سینەماکار و شانۆکار و پەیکەرتاش و چیرۆکنووسەکانیشمان ڕاستە؛ جاران بەهرەیان تەنیا لە زوڵف و خەت و خاڵ و سروشت و گوڵ و باڵندە و چیا و ڕاووشکار و ڕەشماڵ و مەمکی خڕ و سەماوەر و دیمەنی دەرەوەی قەڵات و منارە یان لە شەهیدی حزب و ئەم جۆرە شتانە وەردەگرت؛ تەنانەت زۆربەیان ئەمڕۆش هەر، بەهرە تەنیا لەو شتە بەناو ریالیزمانە و هەندێ جاریش لە کوردایەتی و حزبایەتی و لە ڕابردوو وەردەگرن. بەڵام هونەرمەندی مۆدێرن، دەبێ بەهرە لە بەندیخانەکان و ناو مەحکەمەکانی ئەمڕۆ، لە فڕۆکەکان و ئامێرەکان و قەحپەکان و ئۆتۆمۆبێلەکان و گەڵڵابەکان و ڕافیعەکان، لە بێ ئاوی و بێ کارەبایی و بێ پەساپۆرتیی گەنجەکان، لە قەدەغەکرانی پیاسەکردنی ماچ لە ناو شەقامەکاندا، لە بورجەکانی تەلەفۆنات و ژن کوشتن و کۆچکردنی گەنجان بەرەو هەندەران و بەحری ئیجە، بەهرە لە جووڵەی دراو و ئەنفالکرانی پۆست مۆدێرنی گوندەکانمان وەربگرێت بەرەو ئەو شارانەی کە دەرفەتی هەناسەدان نەک بۆ مرۆڤ بەڵکو بۆ پاسکیلەکانیش نەماوە.

ئێمەی هونەرمەندان نەوەیەکین چەندان جەنگی یەک لە دوای یەکتر ئێمەیان شێلا: جەنگی ئۆتۆنۆمیی ١٩٧٤، جەنگی عێراق - ئێران ١٩٨٠،

ڕاپەڕینی ١٩٩١ و کۆڕەو، جەنگی ناوەخۆیی ١٩٩٤– ١٩٩٨، جەنگی ٢٠٠٣؛ ئەمڕۆش هەر بەردەوام لە ناو پیسترین شەڕ و جەنگەکاندا دەژین. کەواتە ئێمەی هاڕاوی ناو بەرداشی ئەم هەموو جەنگە، زۆر پێویستە بەهرە لەم هەموو شەڕ و جەنگانەوە، سرووش لەم هەموو کارەساتە هەژەندانەوە وەربگرین کە داهاتووی ئێمەیان وێران کرد؛ نەک چی تر لە «کوردایەتی» و گوڵ و پوونگ و پۆڕ و مانگی بەجێماو لە سەفەری شەو. ئێمە پێویستە، عەینەن ئەو مەولیدە زەبەلاحانەی بیست و چوار سەعات جاڕسیان کردووین، تۆڵەی خۆمان وێرانکارانە، ئاژاوەگێڕانە لە دوێنێ و لەم سەردەمە حەقیرە بکەینەوە.

دەربڕینی هەموو ئەو بابەتانەی باسم کرد، لە ناو پەیکەرتاشی و چیرۆک و نیگارکێشی و سینەمادا، لە ناو شانۆ و شیعر و گۆرانی و مۆسیقادا، بەهایەکی دانسقەی هونەری پەیدا دەکەن و جوان دەبنەوە.

بەم شێوەیە؛ بەهایەکی هونەریی نوێ لە چاو بەهای گۆرانییەکانی سەردەمەکانی ڕابردوو، پێویستە، لە ڕێگەی بەهرە وەرگرتن لە دەنگەکانی ئەم دیاردە هاوچەرخانەوە، لە ناو گۆرانیی نەوەی نوێدا دروست بکرێن!

پێویستە هەست و نەستە ئەمڕۆییەکان، دەنگ و سەدا هاوچەرخەکان بخرێنە ناو پێوەندییەکانی نۆتەوە: نەک ئەو سەدا و دەنگانەی کە کۆن بوونە و سواون و بەسەرچوونە. پێویستە ڕیتمی تازەی ژیان بخرێنە ناو نۆتەکانمانەوە نەک ڕیتمە سست و خاوە خەمۆک و دەبەنگەکانی جاران.

ئەوانەی «هیچ گوێیەکی مۆسیقییان نییە»، ئەوانەی مۆسیقارِ و ئاوازدانەر یان ستڕانبێژ نین؛ هەقی خۆیانە بپرسن: ئەرێ دەنگی نوێی چی؟ ڕیتمی تازەی چی؟ چ دەنگێک، چ ڕیتمێک؟ چ دەنگگەلێک ئەمڕۆ تازە دەرکەوتوون و پێشتر لە کۆمەڵی کوردیدا (لە سەردەمی نەسرین شێروانی و کاوێس ئاغادا) نەبوونە، یان بەکار نەهاتوون لە ناو مۆسیقا و گۆرانیی کوردیدا؟

زۆربەی ئەم دەنگانەی لە خوارەوەدا تۆماریان دەکەم، من پێم وایە یان ئەوەتا تازەن و لەم پازدە بیست ساڵەی دواییدا دەرکەوتوون، یانیش ئەوەتا –

ئەگەر پێشتر هەشبووبن – ئەوا بەهیچ شێوەیەک مۆسیقارو ئاوازدانەر و سترانبێژەکانمان ڕۆژێک نەهاتوون بیریان لێ بکەنەوە و حسێبێک بۆ ئەمرۆییبوونی خۆیان لە ناو ئەم هەموو دەنگانەدا بکەن و بەهرەیان لێ وەربگرن؛ نەهاتوون ئەم ڕیتم و دەنگ و سەدا هاوچەرخانە بخەنە ناو پێوەندییەکانی نۆتەوە:

دەنگی دەبابە و تانک و لەشکرکێشییەکان، دەنگی بۆمبابارانکردنی باعەباعی مەڕوماڵاتەکانمان لەسەر ئەو سنوورانەی کە قیژەیان تەنیا بەئاستەم لە ناو ڕۆژنامە ئۆپۆزیسیۆنەکاندا دەنگ دەداتەوە. دەنگی زەندەقچوونی لە ناکاوی سەر جادەکان، تەقینەوەکان، دەنگی لە ناکاو لافاو هەستانی ناو کۆڵانە هەژارەکان، گڤەگڤی سەر بەرزەپردەکان و جنێو بەیەکتردانی ئۆتۆمۆبێلی ناو شەقامەکان..

ئەم (دەنگ) و میلۆدییە تازانەی خوارەوەن، کە تازە دەرکەوتوون و پێویستە تەرجەمە بکرێنە سەر ڕستەی مۆسیقاییی مۆدێرن:

دەنگی ئۆتۆمۆبێلەکان و ڕافیعەکان و موەلیدەی زەبەلاحی گەڕەکەکان و گرێدەرەکان، هاتوهاواری هەفتەی دوو سێ جار خۆپێشاندانە توندوتیژەکان و مانگرتنەکان، دەنگی ناو هۆڵەکانی لەشجوانی و بەرزکردنەوەی قورسایی، دەنگی شەپازللە و گوللە و ئامێرەکان، دەنگی ئەڵاهوئەکبەر ڕۆژی پێنج جار لە ٣٧٦ مزگەوتەوە بە جارێک...

ئەم دەنگ و سەدا و میلۆدییە هاوچەرخانەن کە ئاوازدانەر و سترانبێژی کورد تاکو ئێستا نەیخستوونەتە ناو پێوەندییەکانی نۆتەوە:

دەنگی ناو بەندیخانە و مەحکەمەکان، دەنگی ناو کارگە و کۆمپانیاکان، ئەو هەموو هەراوهوریایەی ناو هوتێل و هۆڵە پڕ لە هەڵاهەڵایەکانی بلیارد و بووکگواستنەوە و ناوبازاڕ و سیتییەکان و پین بۆڵەکان، دەنگی بێ حەیای ئۆتۆمۆبێلی پۆلیس و دەنگی فریاکەوتنی پێش گیان لەدەستدانی ئیسعافەکانی ناو شەقامە قەرەباڵغەکان کە پێت دەڵێ: زوو ڕێگەم بۆ چۆڵکە، کەسێک دەگەیەنم لە گیانەڵادایە...

هەموو ئەمانە چەنێک جوانن؛ جوانییەکی ڕەونەقداری ئەوتۆ کە هەرگیز، تاکو ئەمڕۆش، هیچ یەکێک لە کۆنەپەرست و ڕەحمەتییەکانی سەردەمی تاهیر تۆفیق و حەمەی ماملێ، بە ناسری ڕەزازی و سەعید وەیسیشەوە، نەک هەر هەرگیز دەرکیان پێی نەکردووە، بەڵکو باوەڕیش ناکەن کە ئەم شتانە بکرێ ببنە گۆرانی.

دەنگی چایخانەکان و چاپخانەکان و ڕادیۆکان و تەلەڤزیۆنەکان و سەتەلایتەکان و ڕۆژنامەفرۆشەکان و هۆڵی موحازەرەکان، دەنگی ئەو گۆرانیبێژە سادە و ساویلکە و عەلا ئەساس ڕۆمانسییانە: بەلام تا خەم حەز دەکا ئیزعاج و قێزەوەن.

دەنگی ئەو سترانبێژە شۆڕشگێڕانەی کە لە ناو هۆڵەکاندا دژی ئەنفال و هەڵەبجەیان بۆ مەسەلەی کەرکووک هاتوهاواریانە، بەلام هەرکە دەنگی گرەگڕی هەلیکۆپتەرێکیان لە ئاسمانەوە گوێ لێ دەبێ، یان هەرکە دەنگی تەقینەوەیەکی سەر ڕێگەی کەرکووک لە تەلەڤزیۆنەوە دڵیان دەسمێ، لە دڵی خۆیاندا ناچار بڕیار دەدەن هەرگیز نەچن هیچ کۆنسێرێک بەهیچ بۆنەیەکەوە لە کەرکووک ساز بدەن!

بۆڕەبۆڕی گامێشەکانی بەردەم ڕێکخراوەکانی مەدەنیەت و بارەباڕی مەڕومالاتی ناوەڕاستی هەرای لۆرییەکان و دیدەدیدی ئۆتۆمۆبێلە بەپەلەکان لە ناوەڕاستی فیتەفیتی بێهوودەی شوڕتی مرووڕەکانی کاتی بەیانی: ئەو کاتانەی کە جادە (حەیف بۆ قادر کابان) چی تر ناتوانێ چۆڵ و سێبەر بێ.. بەپێچەوانەی جاران.

دەنگی ئەو فڕۆکە و هەلیکۆپتەرانەی کە لە هەر ڕۆژێکدا پازدە جار – زیاتریش– بەسەر سەری هاتوهاواری خۆپێشاندانی ژنەکان و ئافرەتەکانماندا هەروەها بەسەر سەری گفتوگۆ گەرمەکانی ناو پەرلەمانی کوردستاندا تێپەڕ دەبن و چاویشیان بەهیچ شێوەیەک ئەو هەموو ملیۆن هاوار و ناڵەناڵە بێ پەساپۆرتانەی گەنجەکانمان نابینێ لە ناو نرکە و کڕووزانەوەی ناو ئەم زیندانە جەنجاڵەی وڵاتی خۆیاندا، لە ناو چایخانە پڕ لە

تەق و تۆقەکانی دۆمینەدا..

هەموو ئەم دەنگانە چەنێک جوانن؛ جوانییەکی مۆدێرنی ئەوتۆ کە هەرگیز، تاکو ئەمڕۆش، هیچ یەکێک لە سترانبێژە لیریک و نیشتمانپەروەرەکانی ئەمڕۆ، نەک هەر هەرگیز درکیان پێی نەکردووە، بەڵکو باوەڕیش ناکەن کە ئەم شتانە بکرێن بە گۆرانی.

ڕستەی مۆسیقاییی مۆدێرن لەم دەنگە مۆدێرنانەشەوە دروست دەبێ: نەک تەنیا لە دەنگی مەل و پەپوولە و هەناسە و دەنگی «ناو ڕەزان» و «ناو مەمکان» و «توخوا مەڕۆ بەجێم مەهێڵە..»...

ئەگەر مۆسیقا بەپلەی یەکەم لە دەنگەوە هێز و بڕشتی خۆی (نەک لە وشەوە) هەڵبگۆزێ، ئەوا بێگومان پێویستە هەموو ئەم دەنگە مۆدێرن و هاوچارخانەش نادیدە نەگیرێن.

شاعیرێکی فەرەنسیی برادەرم، هنری دولوی De Luy، کە چەند مانگێک پێش ئەمڕۆ لە هەولێر بوو، لەبارەی دووبارەبوونەوەی بەردەوامی ئەو هەموو مانا و شانەی کە تاقە ئامانجێکیان تەنیا باوەشگرتنێکە بە خۆشەویستدا، گوتی: «ئەو باوەش بەیەکترداگرتن و خۆشەویستییە دەکرێ لە ژووری نووستندا بکرێت و ببڕێتەوە: نەک لە ناو هونەردا».

مۆسیقار دەبێ بتوانێ بزانێت کە (دەنگ) ڕەهەندێکی فیکریی هەیە. دەبێ بزانێ بتوانێت کە (دەنگ) بۆ بەهایەکی فیکری بگۆڕێت؛ بۆ ئەوەی دەنگ بتوانێ ببێتە «دەنگێکی هونەری»؛ بایەخێکی تراجیک پەیدا بکات.

لای شۆپنهاوەر، وەک لای نیتشەش (لە کتێبی لەدایکبوونی تراجیدیا): مۆسیقا ڕۆڵی تراجیدیا دەبینێ، ڕووداوە مرۆڤایەتییەکان لە شێوەیەکی جوانناسیی تراجیکدا پێشان دەدا کە ئامانجەکەی برێتییە لەوەی وامان لێ بکا خۆمان لەبەر ئەو تراجیدیایە (خۆمان لەبەر ئەو شتانە) ڕابگرین کە قابیل نییە خۆیان لەبەر ڕابگیرێ.

بۆیە دەبینین جوانیناسیی کلاسیک ئەگەر جوانیناسییەکی هاوئاهەنگی

بێت؛ ئەوا لای (ڤاگنەر) هاوئاهەنگی نییە، بەڵکو تێکچڕژاوییە.

مۆسیقاری ئەمڕۆ پێویستە بەدوای ئەو دەنگانەدا بگەڕێت کە بایەخێکی فیکری و شارستانی یان بەلای کەمەوە تراجیدییان هەیە، نەک تەنیا ئەو دەنگە سادە یان لادێیانەی کە کۆن بوونە یان کە دەربڕی سۆزێکی ساویلکانەن و هیچ تراجیدیایەکیان تێدا نییە. بیرمەندی ئەڵمانی، شلینگ، لەبارەی هەمان مەسەلەوە ڕەخنەی لە دۆخی سەپاوی مۆسیقای سەردەمی خۆی دەگرت و دەیگوت: «ئایا ئۆپێرا هەر کاریکاتێرێکی درامای زەمانی جاران نییە؟».

لە جیاتی بەنۆتەکردنی دەنگی سروشتی و ڕۆمانسییانە؛ دەنگی واقیعی ئەمڕۆ، دەنگی برسییەتی و بێکاری، دەنگی خۆفڕێدانە خوارە لە بەرزاییەکەوە، دەنگی فریاکەوتن... ئەمانە هەمووی پێویستە لە مۆسیقای مۆدێرندا تەعبیر بکرێن.

بۆ سترانبێژێکی مۆدێرن، بۆ ئاوازدانەرێکی هاوچەرخ، هەموو ئەو دەنگانەی باسمان کرد (دەنگی قیژە و هاواری کیژۆڵەیەک کە خۆی دەسووتێنێ یان دەنگی تەقینەوەیەکی ناوەڕاستی بازاڕێک و دەنگی بۆمبابارانکردنی خانوویەکی سەر سنوور، تەنانەت نرکەنرکی پیرەژنێکی شەرمن، یان بێوەژنێکی حەشەریی خاوەن سێ چوار منداڵی برسی، کە لە بازاڕ دەگەڕێنەوە) بێگومان دەبێ لە پێشەوەتر و گرینگتر بێت لە چاو دەنگی بولبول و مەل و قەل و دەنگی مێخەک و هەرمێ و «هەیاسەکەی».

بە گرینگی دەزانم ئاماژە بۆ هەوڵدانێکی سترانبێژ، سابیر عەبدوڕەحمان بدەم کە لە کۆتاییی سالانی حەفتاکاندا کردی و ناوی لێ نا «مەنەلۆج»؛ بەلام ئەم هەوڵدانە تەنیا لە ئاستی وشەی کۆمەلایەتی و مانای بازاڕیدا مایەوە، ئەمە جگە لەوەی بەمەبەستێکی کۆمێدی کرابوو: نەک بەرهەمهێنانێکی مۆسیقایی و تراجیک کە ئێمە مەبەستمانە.

ئەگەر گۆرانی بە پلەی یەکەم لە میلۆدییەوە، نەک لە وشە و مەعنای

حازربەدەستی سواوە وزە و پۆتانسیاڵەکانی خۆی هەڵبگۆزێ، ئەوا پێویستە ئەم دەنگە مۆدێرن و هاوچەرخانەی باسمان کردن لە پێش هەموو دەنگە لادێیی و سروشتی و کۆنەکانی تر دابندرێن لە ڕاستەڕێگەی تەرجەمەکردنیاندا بۆ سەر ڕستەی مۆسیقایی.

هەموومان دەزانین: دووبارە بەرهەمهێنانەوەی ئەو دەنگانە لە ناو گۆرانیدا، دەنگێکی تازە، «دەنگێکی هونەری» دروست دەکا کە پێی دەڵێین: مۆسیقا. (تەنانەت دەنگی گۆرانیبێژیش دەنگێکی سروشتی یان واقیعی نییە، بەڵکو دەنگێکی هونەرییە: چونکە گۆرانیبێژ هاتووە کاری لە ناو ئەو دەنگەی خۆیدا کردووە).

ئەو دەنگە هونەرییە (کە ناومان ناوە مۆسیقا) توانای ئەوەی هەیە بگۆڕێت بۆ وێنە لە خەیاڵماندا. ئەو دەنگە هونەرییە (کە بە مۆسیقا ناودێرمان کردووە) دەتوانێ وێنە دروست بکا لە ناو هۆشیاری و ویژدانماندا؛ وێنەگەلێک دروست دەکا کە یارمەتیمان دەدەن بۆ ئەوەی کە ئێمەی هەلاهەلابووی ناو ئەو هەموو دەنگە جاڕس و جەنجاڵەی ژیان، لە ناو ئەو ژیانە ناشایستەیەدا، بەشایستەی بزانین بمێنینەوە.

ئەو وێنانەی لە خەیاڵماندا بەهۆی مۆسیقاوە دروست دەبن یارمەتیمان دەدەن بۆ ئەوەی کە ئێمەی ماندووی بێ ئومێد، ئومێدێک لە ناو ئەو دەنگە هونەرییەوە وەدی بکەین، هەروەها ئیرادەیەک، ئیرادەی ژیان و ئیرادەی هێزیش.

ڕەخنەی من لە هیگڵ ئەوەیە کە ئەو، مۆسیقا دەبەستێتەوە بە جیلوە سەرەتاییەکانەوە، وەک ئاوازی خوێندنی باڵندان، یان هاوارە بێ وشەکانی لە سروشتەوە دێنە دەر. ئەمەش عەینەن وەک ئەمە وایە کە ڕەخنەگرێکی ریالیست یان ناتورالیست بێت داوا لە شێوەکارێک یان لە ڕۆمانووسێک بکات سروشت و واقیعت دەقاودەق وەک خۆی بۆ بگوازێتەوە ناو تابلۆیەک یان ناو ڕۆمانێک.

کەواتە، بۆیە، پێویست وایە مۆسیقا توخمێکی کارای ئەوتۆی بچێتە ناو کە هەرگیز لە ناو سروشت و واقیعدا (لە ناو ئەو هەموو دەنگانەی ڕیزمان کردن) بوونی نەبێ و هێشتا دروست نەکرابێ: لە مێشکی خودی هونەرمەندەوە بەوەلەد هاتبێ. چونکە دەنگە سروشتی و واقیعییە قۆڕەکانی هەن (ئەوانەی ڕیزمان کردبوون) تەنیا وەک کەرەستەیەکی خام، یان وەک قۆناغێکی پێش دروستکردنی مۆسیقا حسێبیان بۆ دەکرێ.

کەواتە مۆسیقا تەنیا لەو کاتەدا دەبێتە مۆسیقا کە ئەگەر لە جیهانێکی تاکرەوی جیاواز و تازەوە هەڵقوولاّ؛ توانیی جووڵەیەکی خۆئاگایی یان نائاگایی لە مرۆڤدا دروست بکا بەرەو ژیان، بەرەو داهاتوو...

ئی. تی. ئەی هۆفمان Hoffmann لە تۆژینەوەیەکی خۆیدا لە ساڵی ١٨١٠ لەبارەی سەمفۆنیای پێنجەمی بیتهۆڤنەوە دەڵێ: «مۆسیقا دەرگا و پەنجەرەکانی جیهانێکی نادیار بۆ مرۆڤ دەخاتە سەر پشت، جیهانێکی ئەوتۆ کە بەهیچ شێوەیەک لە جیهانی واقیع و حەواسەکانمان ناچێت؛ مرۆڤ وا لێ دەکا هەموو ئەو هەستانەی خۆی کە قابیلن بۆ دەسنیشانکردن بەلاوە بنێت و بوونی خۆی بسپێرێتە شتە هێشتا نەگوتراوەکانەوە».

لە سەرەوە گوتمان «دەنگ دەتوانێ بگۆڕێت بۆ وێنە لە ناو ئاگایی و خەیاڵماندا». ڕاستییەکەی، من ئەم تێزەم لەسەر بنچینەی تێزەکەی سیگمۆند فرۆیدەوە بەرهەم هێنا کە دەڵێ: «دەنگ دەتوانێ بگۆڕێت بۆ وێنە لە خەوندا. دەنگ دەتوانێ وێنە دروست بکا لە ناو خەونی کەسێکی نوستوودا». فرۆید بۆ سەلماندنی قسەکانی خۆی نموونە دەهێنێتەوە: دەنگی شوڕەی ئاو لای کەسێکی نوستوو لە خەونیدا دەگۆڕێت بۆ ڕووبارێک کە خەریکە بەناویدا تێ دەپەڕێت یان تێیدا دەخنکێ. ئەگەر مقەستێک بە مووکێشێکدا بخشێنیت لە بنگوێی کەسێکی نوستوودا، لە خەونیدا وێنەیەکی سامناکی ژیانی ڕۆژانەی لەلا دروست دەکا. ئەم ڕاستییە، فرۆید لە کتێبی (لێکدانەوەی خەونەکان)دا زۆر باریکبینانە ڕوونی کردووەتەوە.

وابزانم ئێمە بۆ سەلماندنی هەمان ڕاستی (دەنگ دەتوانێ وێنە دروست بکا

لە ناو خەیاڵ و هۆشیاریماندا) وەکو فرۆید پێویستیمان بە نموونە هێنانەوە نییە. چونکە ئاشکرایە: وەک چۆن (چۆنیەتیی دەنگ) دەسنیشانی ئەوە دەکات کە نوستوو چ خەونێک ببینێ؛ ئاوهاش ئاشکرایە چۆنیەتیی دەنگی هونەری (مۆسیقا) دەسنیشانی ئەوە دەکات کە مرۆڤی بێدار و خاوەن ویژدان چ «خەونێکی زیندوو» دەبینێت و چ وزە و هێزێک وەک چورکەی شیری دایکی، دەترنجێتە ناو ئیرادەیەوە بۆ فراژووبوون.

ئەمە مانای وایە، مۆسیقا (دەکەوێتە سەر هەر دەنگێک و هەر ڕیتمێک) دەتوانێ دڵتەنگمان بکا یان شاد، تووڕە یان نیگەران، ترسنۆک یان ئازا... هتد.

بۆ جەختکردنەوە لەسەر هێز و ڕۆڵی دەنگ، ڕوخسەتم بدەن قسەیەکی زیاد دووپات بکەمەوە و بڵێم: قسە (هەموو قسەیەکی مانادار) بەپێی ئاوازەکەی، واتە بەپێی ریتم و ئیقاعی وشەکانی، مانای دەگۆڕێ. بۆ نموونە:

– من ناتوانم ئەم کارە بکەم.

– «من» ناتوانم ئەم کارە بکەم.

– من «ناتوانم» ئەم کارە بکەم

– من ناتوانم «ئەم کارە» بکەم.

تەنانەت زۆر جاران یەک تاقە وشەیەکیش، بەهەمان شێوە:

– هەمانە

– هەمانە.

یان:

– نا

– نا؟

– نا.

– نا!؟

– نا..؟ (بەگاڵتە پێکردن بەو کەسەی بەرامبەرت).

کەواتە زمانی مۆسیقا دەکرێ سوودی لێ وەربگیرێ بۆ گەیاندنی وردترین و دیاریکراوترین مەبەستە بچکۆڵەکان کە لە زمانی زماندا بەهیچ شێوەیەک ئەم باریکبینییە بەرهەم ناهێندرێ. (زمانی زمان)؟ بەڵێ، گوتم (زمانی زمان)، چونکە (زمانی مۆسیقا)ش هەیە.

کەواتە، مادام ئێمەی مرۆڤ دەتوانین فەرقی نێوان مانا جیاوازەکانی ئەم ڕستانەی بەنموونە هێنامنەوە تەنیا بەهۆی ئاوازەوە لە یەکتر هەڵبوێرین؛ ئەمە مانای وایە: زمان بەبێ مۆسیقا، زمان بەبێ میلۆدییەکەی، زمان نییە؛ چونکە هەمیشە سەرچیغمان دەبات و تووشی هەڵە لە یەکتر تێگەیشتنمان دەکات.

هەمیشە لایەنێکی مۆسیقایی لە هەر جۆرە بەکارهێنانێکی زماندا هەیە.

لێرەوە دەتوانین بەرەنجامێکی ورد و لۆجیک لە هەمان کاتدا بەدیهی وەدەست بهێنین و بڵێین: زمان ڕەگ و ڕیشەکانی خۆی لە ناو مۆسیقاوە هەڵێنجاندووە؛ زمان لە سەرچاوەکانی مۆسیقاوە خۆی پەروەردە کردووە. هەر بۆیەش مۆسیقا وەکو زمانێک لێی کۆڵدراوەتەوە، وەک جۆرە زمانێکی سەربەخۆ و تایبەت تەماشای کراوە.

هەر لەبارەی مانای مۆسیقاوە چەند قسەیەکی تر دەکەم.

بەرتەکدانەوەمان لە دوای بیستنی هەر مۆسیقایەک ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ کە مرۆڤ بەهۆی بیستنی مۆسیقاوە هەمیشە ئامادەییەکی پێشوەختی هەیە بۆ:

١– وەبیرهاتنەوە (ڕابردوو)

ئەم دۆخە بەشێوەیەکی گشتی ڕۆمانسی و نۆستالجیک (گریان بەسەر ڕابردوودا) یانیش وەک فەرەنسییەکان دەڵێن مێلانکۆلیکە. بۆیە ئەم وەبیرهاتنەوەیەی ڕابردوو مردووترین دۆخە؛ مردووترین مۆسیقاش بەرهەمی هێناوە؛ ئیرادەی مرۆڤ دەمرێنێ.

بەشێوەیەکی گشتی، بەیت و حەیرانەکانی حەسەن سیساوەیی و عەفاف ڕازی و هەندێ لە گۆرانییەکانی زوڵفیەی ئازەربایجانی و زەکی مۆڕانی تورک دەچنە ئەم خانەیەوە.

دۆخی وەبیرهاتنەوە (ڕابردوو) دوو جۆری هەیە:

یەکەمیان: ئەگەر تۆ پێشتر ئەو مۆسیقایەت لە شوێنێک یان لە کاتی ڕووداوێک گوێ لێ بووبێت، ئیتر مۆسیقاکە ئەو شوێن و ڕووداوە و کەسەکانی ئەوێ و شتەکانی ئەوێت (ئەتمۆسفێری ئەوێت) بیر دەخاتەوە. بۆ نموونە من بۆ خۆم هەمیشە مۆسیقا و گۆرانیی (اغدا القاك)ی ئوم کەلسووم ئەو ڕۆژانەی ناو بەندیخانەی هەولێرم لە بەرامبەر پەرلەمانی ئەمڕۆ بیر دەخاتەوە چونکە جەلادەکان شەوان ئەو گۆرانییەیان دەخستە سەر و من لە ژووره ئینفیرادییەکەی خۆمەوە گوێبیستی دەبووم.

دووەمیشیان: مۆسیقاکە، خودی تۆن و ریتمەکەی یان ئاوازەکەی، بەشێوەیەکی ڕۆمانسی و نۆستالجیک، دەتخاتەوە بیری ڕابردوو. وەک ئەوەی پێت بڵێ «من یارێکم هەبوو، یان من وڵاتێکی خۆشم هەبوو». یەکێک لە شاعیره فەرەنسییە ڕۆمانسییەکانی کۆتاییی سەدەی نۆزدەم دەیگوت: «من یارێکم هەبوو، خۆشترە لەوەی بڵێیت من یارێکم هەیە».

٢- مرۆڤ بەهۆی بیستنی مۆسیقاوە هەمیشە ئامادەییەکی پێشوەختی هەیە بۆ ورووژان (ئێستا).

ئەم دۆخە بەشێکی زۆری ئەو جۆرە مۆسیقا و گۆرانییانە دەگرێتەوە کە ئەمڕۆ بوونەتە مۆدێل و خەڵک گوێی لێ ڕادەگرن، زۆربەی ئەو ئاواز و گۆرانییانە دەگرێتەوە کە ئاوازدانەر و مۆسیقاژەنەکان حەز دەکەن دای بڕێژن و کلیپی پێ دەربکەن و بەهۆیەوە لەسەر تەلەڤزیۆن دەربچن و لە ڕادیۆکانیش لێ دەدرێنەوە. گۆرانییەکانی حەسەن زیرەک و مەهەستی و زەکەریا و کینی ڕۆجەرس و دیمس ڕووسۆس و لەیلا فرووهەر و عەزیز وەیسی دەچنە خانەی ئەم دۆخەوە. خەڵک بەشێوەیەکی گشتی حەزیان لێیە چونکە ئەمڕۆیان و

دەروونیان دەورووژێنن و ئێستایان دەدوێنن: «خۆشە».

ئەم جــۆرە مــۆســیــقــایە، عــادەتەن دەوڵەت و حکوومــەت حــزبەکــان و مەسئوولەکانیش زۆر پێیان خۆشە: نەک پێیان خۆشە، بەڵکو بەلایانەوە باشە، چونکە زۆربەی جـار دەبێـتـە مکیـاجـێک و بەڵگەیەک بۆ سـەلماندنـی بوون و چالاکیـیـەکانی خـۆیان و بەهەدەردانی بودجەیەکی مـەسرەفگەرای ئـەوتۆ کە تێیدا ببێتە هەنجەتێک و دەرفەتێک تا پارە ببەشنەوە سەر «هونەرمەندەکان» و فـەرمانبـەرەکـانیـان، ئەمە جگە لەوەی هەندێ جـار دەبێـتـە ئـامرازێکیش بۆ چرپاندنی ئایدیۆلۆجییەکەیان و بیرخستنەوەی شکۆمەندییەکانی ئەمڕۆ و ڕابردووی خۆیان بەگوێی جەماوەردا.

٣- مرۆڤ بەهۆی بیستنی مۆسیقاوە هەمیشە ئامادەییەکی پێشوەختی هەیە بۆ تەکان (بەرەو داهاتوو: بەرەو نادیاری).

ئەم دۆخە ڕەسەنترین دۆخە، جۆری ئەو مۆسیقایەش کە ئەم دۆخە (تەکان بەرەو داهاتوو) دەخوڵقێنێ، زیندووترین مۆسیقایە.

هەموو مۆسیقاڕ و گۆرانیبێژێک ناتوانێ بەئاسانی ئەم جۆرە دۆخە (تەکان بەرەو داهاتوو) بەهۆی گۆرانی و مۆسیقاوە لای بیسەر دروست بکات: تەنیا مەگەر بەڕاستی هونەرمەندێکی تراجیک و ڕەسەن نەبێ.

لە هەمان کاتدا لەوانەیە هەموو جۆرە بیسەرێکیش هەستی جوانیناسیی ئەوەندەی نەبێ کە بەبیستنی ئەم جۆرە گۆرانی و مۆسیقایە «تەکان بەرەو داهاتوو» بیشڵەژێنێت.

مۆسیقاژەن یان گۆرانیبێژی سەر بەم چەشنە ئاوازە، مۆسیقا هەموو ژیانی ئەوە، گۆرانی سەرجەم سامانی ئەوە: لە مۆسیقا زیاتر، هیچ مانا و بەها و هێزێکی تری نییە.

هونەرمەندی لەم جۆرە، ژیان و ڕابردووی خۆی و هەموو ئێستاشی لە ناو ئەو چەند چرکەیەدا کۆکردووەتەوە بۆ ئەوەی کاریگەریی خۆی بۆ دروستکردنی داهاتوویەکی جیاواز کە بە دڵی خۆی و بەپێی ویست و

هۆشیاریی خۆی بێ، دروست بکا. ئەو بەڕاستی خەونی نوقڵانەبەخشی دنیا لێک دەداتەوە و بەردەکەی سیزیف دەگەیەنێتە سەر شاخ، هەور دەدۆشێ، واقیع هەڵدەتەکێنێ، ئیعتیراز لە دەسەڵات و چارەنووس و قەدەر دەگرێ، گۆرانی لەبارەی شەرمنەکانەوە دەڵێ، نابیناکانمان بیر دەخاتەوە، بیابان ئاو دەدا، پێوەندیی سەفەر و سەرهەڵگرتن بە برسییەتی و بێکاری و خۆپێشاندانەکان دەبەستێتەوە، کۆنسێرتێکی بچکۆلانە دەکاتە یەک پارچە شانۆیەکی تراجیک، دەیەوێ دەرگەی تەنانەت بەندیخانەکانیش بخاتە سەر پشت..

ڤاگنەری ئەڵمانی و مشکۆی هەولێری و ژاک بغێلی فەرەنسی و بڵند ئارسۆی تورک و لیۆ فێغێی فەرەنسی و کەمێک لە گۆرانییەکانی جۆرج وەسووف و هەندێ گۆرانییەکانی داریووشی فارس لەم جۆرەن. هەروەها وەک دەزانن ئەو جۆرە گۆرانییەی پێی دەڵێن (ڕاپ) «لەم بارەوە ئافەرین بە گرووپی پلان توو دەڵێم» ئەویش دەچێتە ئەم دۆخەوە.

من هەمیشە کاتێ گوێ لە ژاک بغێل ڕادەگرم حە زدەکەم بەڕەڵا – ئەگەر نیوەشەویش بێ – بە کۆڵانان بکەوم. کاتێ گوێ لە لیۆ فێرێ ڕادەگرم دەمودەست حەز دەکەم خۆپێشاندانێک ساز بدەم و بەگەڵ خۆپێشاندانێک بکەوم. یان کاتێ گوێ لە گۆرانییەکانی ژیلبێرت بێکۆنی فەرەنسی ڕادەگرم هەست دەکەم پارە و پوولم زۆرتر بووە و دەوڵەمەند بوویمە.

مشکۆ دەگێڕێتەوە دەڵێ جارێکیان کە شەهابە گۆرانیی گوتووە، پەنجەرەی ماڵەکە لەگەڵ دەنگی ئەو ورد و هەراش بووە». هەر لە شەهابە دەگێڕنەوە کە ئوم کەلسووم کاتێ گوێی لە دەنگی شەهابە بووە یەکسەر عاشقی بووە و دوای ئەوە دەعوەتی کردووە بۆ قاهیرە. من لە ڕۆمانی (حەکایەتی باوکم)دا بەفراوانی باسی ئەم حاڵەتەم کردووە کە چۆن جۆرە ئاواز و گۆرانییەک هەیە وات لێ دەکا دەمودەست بچیت شتێک بکەیت و تەکانێک بدەی، بەرەو داهاتوو بڕۆیت و شتێک ئەنجام بدەی کە دەمێکە لە کەڵکەڵەتدا بووە بەڵام تەنیا لەگەڵ بیستنی گۆرانییەکەدا باوەڕ و هەوەس و هێزی ئەوەت پەیدا کردووە بیکەیت.

بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەم دۆخە و ئەم جۆرە مۆسیقایە، نموونەیەکی بچووک لە ڕۆمانەکەی خۆم دەهێنمەوە:

هەر کاتێ شەهابە دەستی دەکردە خوێندن، ئیتر هەر یەکێک لەوانەی گوێیان لە دەنگی دەبوو تووشی حاڵەتێکی دەروونیی وا دەهاتن کە جیاواز بوو لە حاڵەتی کەسێکی تری گوێگری هەمان گۆرانی: بۆ نموونە یەکێک -کاتێ گوێی لە دەنگی دەبوو- حەزی دەکرد بچێ تێر تێر پێ بکەنێ. یەکێکی تر کاتێ گوێی لە دەنگی دەبوو، دەیگوت:

- حەز دەکەم بچم دیوارەکانی ماڵەکەمان سەرلەنوێ بۆیە بکەمەوە.

کەسێکی تر دەیگوت:

- من کاتێ گوێم لە دەنگی شەهابە دەبێ.. یەکسەر ئەوەم بیر دەکەوێتەوە کە دەبێ بچم کاریتە داڕزاوەکانی بنمیچی ماڵەکەمان کە ساڵانێکی زۆرە کەمێک سنگیان داکەوتووە بیانگۆڕم.

کەسێکی تر دەیگوت:

- من بە دەنگی شەهابە یەکسەر خەیاڵی ئەوە دەمگرێ بچم هەرچی پۆلیس و حەسحەسی ناو کۆڵان و شەقامە تاریکەکان هەن بیاندەمە بەر شەق و شولاق.

کەسێکی تر دەیگوت:

- من کە گوێم لە دەنگی شەهابە دەبێ.. پڕ بە دڵ حەز دەکەم ببمە تاوسێکی غەمگین و بفڕم .. هەرگیزیش نەیەمەوە ئەم هەولێرە.

یەکێکی تر دەیگوت:

- کاتێ گوێم لە دەنگی شەهابە دەبێ.. دڵم زۆر توند دەبێ و کەڵکەڵەی ئەوە دەکەوێتە سەرم کە بچم خۆم بکوژم.

ڕاستییەکەیشی، دەیانگوت ژنێک لە کۆڵانەکەی تەنیشت حەمامی عەلیاغای گەڕەکی خانەقا، ڕۆژێک کاتێ لە ناکاو گوێی لە قۆریاتێکی شەهابە دەبێ، لە سەربانی ماڵەکەی خۆیانەوە خۆی فڕێ داوەتە خوارەوە و یەکسەر مێشکی

پژاوە. جگە لەمەش پیاوێک ئێوارەیەکی هاوین، لە باغەکەی سەعید ئاغا کاتێ بەسەرخۆشی گوێی لە دەنگی قۆریاتێکی شەهابە دەبێت، یەکسەر لە ناو باغەکەی سەعید ئاغا سەرمەستی دەنگی شەهابە، دەیگرێت و بەبرادەرێکی خۆی دەڵێ «دەمەوێ بچمەماڵەوە»، ئەویش لێی دەپرسی «بۆچی؟»، پێی دەڵێ «دەمەوێ بچم ژنەکەی خۆم بکوژم». کابرای برادەری ئەو پیاوە گێڕابوویەوە دەیگوت «چەند بەدوای کابرا کەوتم و بانگم لێی کرد بۆ ئەوەی نەچێت ئەم کارە بکا.. کەچی دوای چەند دەقیقەیەک هەر بەغار خۆی گەیاندبووە ماڵەوە و بێ هیچ پرس و قسە و پێشەکییەک سێزدە چەقۆی لە ژنەکەی خۆی دابوو».

زۆر کەسی تریش هەبوون، لێیان دەگێڕایەوە کە بەبیستنی دەنگی شەهابە خۆیان کوشتووە. کەچی خەڵکی واش هەبوون، دەیانگوت «کاتێ من گوێم لە دەنگی شەهابە دەبێ.. حەز دەکەم جەنتاکەم کۆ بکەمەوە و سەفەر بکەم». هەشبوون دەیانگوت «کاتێ من گوێم لە دەنگی شەهابە دەبێ.. حەز دەکەم بچم چی موڵک و ماڵم هەیە بیدەمە هەژار و سواڵکەرەکانی دەوروبەری مەرقەدەکەی سوڵتان موزەفەر».

هەر لە گەڕەکەکەی خۆمان پیاوێکی خمچی هەبوو، بەئەسڵ جوولەکە بوو، پێیان دەگوت «شەمعوون بنجوو».. پێش چەند ساڵێک بەهۆی بیستنی دەنگی شەهابەوە بەخۆی و ژنەکەی و هەر پێنج منداڵەکەیەوە بووبوونە موسڵمان. دەیگێڕایەوە دەیگوت:

– من جاران کاتێ گوێم لە دەنگی شەهابە دەبوو، من و ژنەکەشم و هەر پێنج منداڵەکانمان حەزمان دەکرد یەکسەر بچین شەهادە بێنین و ببینە موسڵمان.. بەڵام ئێستا لەوەتەی لە سای خوا و پێغەمبەری ئیسلامەوە بووینەتە موسڵمان و شەهادەمان هێناوە؛ ئێستا هەر کاتێک گوێمان لە دەنگی شەهابە دەبێ.. خۆم و ژنەکەم و هەر پێنج منداڵەکەشم، هەموومان پێکەوە حەز دەکەین بچین کۆترەکانی منداڵەکانمان ببەینە سەربان و گەمەیان لەگەڵ بکەین و پاشان پێکەوە لەسەر بان ئەو کۆترانە هەڵبفرێنینە ئاسمان بۆ ئەوەی چەند سەعاتێکی تر دیسان بێنەوە بۆ لیسەکانی خۆیان. هەموومان

ئێستا کاتێ گوێمان لە دەنگی شەهابە دەبێ؛ حەز دەکەین بچینە سەربان کۆترەکانمان هەڵبفڕێنین.

لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو کە مەلافەندیی ئیماندار و مەلای دوازدە عیلم و گەورەی هەولێر – خۆیشی، کە شەهابەی دەنگبێژ لەلای خۆی پەروەردە کرابوو؛ زۆر کەس لێیان دەگێڕایەوە دەیانگوت:

– کاتێ مەلافەندی گوێی لە دەنگی شەهابە دەبێ.. هەمیشە حەز دەکا بچێت گۆزەیەکی پڕ پڕ شەڕابی سوور بنێتە سەر دەمی خۆیەوە و تا پێی بکرێ خۆی بەدمەست و سەرخۆش بکا.. بەڵام لەبەرئەوەی جەنابی مەلافەندی ئیمانداریکی گەورەیە و بەشەرع بۆ ئەو جائیز نییە بخواتەوە؛ بۆیە تا ئێستا نەیتوانیوە بە هیچ شێوەیەک ئەمە بکات.

بەم شێوەیە، مۆسیقای ڕەسەن (مۆسیقای جۆری سێیەم) کە مۆسیقایەکی مۆدێرنە و لە دەنگە هاوچەرخەکانی ئەمڕۆوە بەهرەی وەرگرتووە؛ هەمیشە ئێمە بەرەو جووڵە و تەکانێکی خۆکار و نائاگا لە خۆمان پەلکێش دەکا کە تازە زانیومانە ئەو خولیا و کەڵکەڵە و بێداری و هێزەمان تێدا هەیە: ئەمەش خودی هۆشیاریی هاوچەرخ و ویژدانی بێداری ئەمڕۆییمانە.

لای شۆپنهاوەر مۆسیقا باشترین پێشاندەری هێزەکانی نائاگاییە: «ئاهەنگساز قووڵترین ئەو گەوهەرانە دەردەبڕێ و کانگاییترین ئەم حیکمەتانە دەخاتە زمان کە عەقڵ خۆیشی لە تێگەیشتنیان دەستەوەستان دەمێنێتەوە».

ئەم جۆرە مۆسیقا ڕەسەنەی باسم کرد، وەک ئەبولهۆل بیسەر سەرسام، وەک جنۆکەیەک دەست لە گوێگر دەوەشێوێنێ.

هەندێ جار تەنیا یەک ڕستەی مۆسیقایی لە گۆرانییەکدا ئەم هەستەت لەلا دروست دەکا. ئەمەش دەقاودەق، بێ زیاد و کەم پێوەندیی بە خودی مۆسیقا یان ئاوازەکەوە هەیە نەک بە دێرە شیعرییەکەیەوە، پێوەندیی بە خودی دەنگ و (چۆنیەتیی گوتن)ەکەوە هەیە نەک بە وشەکانەوە.

من لەبارەی چۆنیەتیی گوتنەوە، لەبارەی میلۆدییەوە، حەز دەکەم ئێوە

خۆتان بەراوردێک بکەن لە نێوان ئەم دوو ڕستە مۆسیقاییەی خوارەوە کە وشەکانی هەردووکیان هەمان شت و هەمان ناوەرۆکن بەڵام دوو گۆرانیبێژی کوردی دوو سەردەمی جیاواز، بە دوو شێوازی جیاواز و دوو گۆتنی جیاواز (یەکەمیان بە کوردی، ئەوەی تر بە تورکمانی) گوتوویانە: ڕستەی مۆسیقایی (سووتا...) کە لە زمانی تورکمانیدا دەبێتە (یاندی).

– مشکۆی هەولێری کاتێ دەڵێ (یاندی جانم.. توتوشتو یاندی جانم)، بە زمانی تورکمانی واتە (سووتا گیانم.. گڕی گرت، سووتا گیانم).

گوێ بدەنێ و ورد ببنەوە کە مشکۆ ئەم وشە زۆر سادە و ساکارانە بە چ تەکانێک بەرەو داهاتوو دەچڕێ. مشکۆ بە چ ئازارێکەوە، چەند ئاژاوەگێڕانە، چەند سووتاو لەگەڵ سووتانەکەی خۆیدا بۆ داهاتوو دەسووتێ! چۆن لە ڕۆحەوە فوو بە وشەکەدا دەکات و وا دەکا هەموو ئینجێکی هەر حەرفێکی وشەکە چەندان نۆتە و شەپۆل و شەپۆلدانەوەی تێدا دروست بکا:

(یاندی جانم.. توتوشتو یاندی جانم)..

– ئەمە لە کاتێکدا عەدنان کەریم کاتێ دەڵێ (سووتا ڕەواقی خانەیی سەبرم..) کە دێرە شیعرێکی زۆر مەزنی نالیی شاعیرە، هیچ هەست ناکەی کە وشەی (سووتا) یان تەنانەت (هەموو دێرە شیعرەکەش) هیچ تراجیدیا و ئازارێکی ئینسانی، هیچ مانا و هێز و شەپۆل و شەپۆلدانەوەیەکی مۆسیقاییی تێدا بێت.

ئەگەر بەراوردی ئەم دوو جۆرە دەربڕینە لە یەکتر جیاوازە بکەن، لە مەبەستەکەی من حاڵی دەبن کە دەمەوێ بەم نموونەیەی هێنامەوە دوو شت ڕوون بکەمەوە:

١– ئەو مۆسیقایەی کە من ناوم نا «ورووژانی ئێستا» لە چاو ئەو مۆسیقایەی کە ناوم ناو «تەکان بەرەو داهاتوو» جیاوازییان چییە!

٢– جوانیی مۆسیقا پێوەندیی بە چۆنیەتیی گوتنەوە هەیە؛ ڕەسەنایەتیی

گـۆرانی پێـوەندیی بە مـیلۆدی دەربڕین و مـوزیکسـازییـەوە هەیە: نـەک بە ڕیزکـردنـی وشـەکانەوە. وەک چـۆن مـاناش پێوەنـدیی بە چۆنیـەتـیی دەربڕین و تەکنیـک و فـۆرمـەوە هـەیە. ئەمـەش نـەک تـەنیـا لە مـۆسـیـقـادا بەڵکو لە هـەمـوو هونەرێکدا.



زمان لەوانەیە هەندێ جار لەبەر خاتری خۆی، لە
بەرهەمێکدا کە تێیدا زمان ئاماژە تەنیا بۆ خودی
خۆی دەکا، سەرهەڵبدات.

میشێل فۆکۆ

من وا تێ دەگەم: مۆسیقا (مۆسیقای بێ گۆرانی، مۆسیقای بێ وشە) باڵاترین شێوەی هونەر و بەرزترین شێوەکانی مۆسیقایە.

کاتێ لە دانیمارک پەناهەندە بووم، لە جەنگ و نەهامەتی و ماندوویییەکی بێ ئەندازەوە گەیشتبوومە دوورگەی میدڵ گراندی دانیمارک و ڕۆحم بە هیچ شتێک ئۆقرەی نەدەگرت، لە بەیانییانەوە تاکو نیوەشەو هیچی ترم نەدەکرد: جگە لە گوێگرتن لە مۆسیقا، گوێگرتن لە سەمفۆنیاکان. لەو دوورگەیە بوو کە من بۆ یەکەم جار چوار وەرزەکەی ڤیڤاڵدیم ناسی. هیتفۆنم بەگوێچکەمەوە دەنا و بەردەوام بەردەوام گوێم لە مۆسیقای بێ وشە، لە سەمفۆنیاکان ڕادەگرت. تەنانەت ئەو کاتانەی ماندووش دەبووم، لەسەر پشت پاڵ دەکەوتم و گوێم لە مۆسیقا.. تا دەنووستمەوە. ئەمە بوو منی لە دەست ڕابردوو (لە دەست ئەو هەموو لێکدانەوە پڕوپووچانەی پێشتر بۆ ژیان کردبوومن) ڕزگار کرد، ئەمە بوو داهاتوویەکی تازەی (وەک ڕێگەیەک کە هەرگیز هیچ مانایەکی بەسەردا نەڕۆیشتبێ) پێشانی من دا و منی نوێ کردەوە: مۆسیقای بێ وشە...

وشە زۆربەی جار خیانەتمان لێ دەکا. وشە زۆربەی جار – وەک لە سەرەوەدا باسم کرد – سەرچیغمان دەبا. وشە زۆربەی جار ماندووتر و کاسترمان دەکا.

پشتبەستن بە زمان بۆ ڕێبەراتیکردنمان، واتە ئەگەر زمان چاوساغمان بێت و ڕێبەرایەتیمان بکات بەرەو ناسین و ئاسوودەبوون و تەنانەت تێگەیشتن لە ڕاستی: هەڵەیەکی زۆر گەورەیە (مرۆڤ ئەگەر درۆ بکات لە دەنگییەوە دەردەکەوێ) چونکە میلۆدیی دەربڕین هەرگیز ناتوانێ درۆ بکات، بەڵام

وشەکان دەتوانن.

ئەمە جگەلەوەی کە زمان (زمانی زمان: زمانی قسەکردن) بە ڕادەی پێویست هەرگیز نەیتوانیوە هێندە کارا بێت و بتوانێ هەست و نەستەکان بەتەواوەتی دەرببڕێ، بەڵکو تەنیا لە توێکڵی شتەکان دواوە. ئەمە لە کاتێکدا تاقە ئامرازێکی تواناداری دەربڕین و تاقە هەوڵدانێکی غەیری زمان: مۆسیقایە.

من، کە جار بەجار شیعر دەنووسم، لەم ڕووەوە، لەوەتەی بەبیرم دێ: حەسوودیم بە مۆسیقاژەنەکان بردووە؛ بە نیگارکێشەکانیش هەڵبەتا.

زانین ئامرازێکە لە پێناو پاراستنی تاکەکەس. لەم ڕووەوە بنچینەی زهنیەت زەرکەفتکردنی زاتە، نەک بەهرەیەکی عەقڵمەندانە کە ئێمە بە ئامانجێکی ئەخلاقی یان ئایدیۆلۆجیک هیدایەت بکا.

مۆسیقا نابێ لاسایی ژیان و واقیع بکاتەوە (نە حەزحەزۆکانێ، نە نیشتمانپەروەری) بەڵکو تەعبیر تەنیا لە جیهانێک دەکا، پێشبینییەک. لەم ڕووەوە، شاعیری ناوداری ئەڵمان، نۆڤالیس لە «زمانێکی موتڵەقی شاعیرانە» دەدوا کە هیچماناشی نەبێ.

مۆسیقا پێویستە سەربەخۆ بێ، قابیل نەبێ بکرێتە هیچ زمانێک، هیچ گێڕانەوەیەک.

من لەبەر هیچ نەبێ، لەبەر ڕاستییەکی زۆر ڕوون و ئاشکرا باوەڕم بەم قسانەی خۆم هەیە کە دەیانکەم، ئەویش ئەوەیە – وەک هەموومان دەزانین: نۆتە ناوەرۆکێکی هەیە. نۆتە – خۆیشی ناوەرۆکێکی هەیە. هەموو نۆتەیەک ناوەرۆکێکی هەیە. کەواتە، مۆسیقا، بۆیە، پێویستی بە ئامرازێکی تری وەک وشە نییە بۆ بەیانکردنی خۆی؛ بەپێچەوانەوە دەتوانێ بۆ هەمیشە بەرگی وشە لە خۆی داکەنێت و هەتاهەتایە ڕووت بژی! ئەبستراکت عەینەن ڕەنگ.

ئادۆرنۆ دەڵێ: «ڕێبەرەکانی ئۆرکسترا لە ڕێگەی جووڵە جۆراوجۆرەکانی دەست و کەللە و حاڵەتەکانی دەموچاویانەوە دەتوانن مۆسیقا بە هەر

ئاقارێکی کە خۆیان بیانەوێ ببەن بێ ئەوەی ئەسڵەن پێویستیان بە هیچ وشەیەک بێت».

شۆپنهاوەر یەکێکە لەو فەیلەسووفانەی کە پێ لەمەش زیاتر هەڵدەبڕێت و دەیەوێ هەقیقەتی میتافیزیکبوونی مۆسیقا بسەلمێنێت، دەڵێ: «مۆسیقا قسە لەبارەی شتەکانەوە ناکا، هیچ شتێک دەرنابڕێ تەنیا غەم و شادی نەبێ، کە تاقە واقیعییەتێکی پێوەندیدار بە ئیرادەی مرۆڤەوەن»؛ «مۆسیقا ڕاستەوخۆ ئیرادە دەوروووژێنێ».

شۆپنهاوەر بۆیە وا دەبینێ: باڵاترین ڕاستییەکان هێشتاش هەر لە ناو هونەردا حەشار دراون نەک لە ناو زانست و قانوون و فەلسەفەدا.

ئایا لە کۆتاییی ئەم وتارەدا، دەمەوێ سەرجەم بۆچوونەکانی پێشکێشم کردن، بەرەو ئەو ئاقارە ببەم کە بڵێم: «مۆسیقای ئەبستراکت» واتە مۆسیقای بێ وشە لە هەموو جۆرەکانی تری مۆسیقا و گۆرانی بە گرینگتر و هونەرتر بزانین؟

لە مۆسیقادا مادام میلۆدی و دەنگ و ئاواز پلەی یەکەم و لە پێشەوەتریان هەیە و دەبنە مەرجی سەرەکی بۆ بەهونەرکردنی گۆرانی، کەواتە گۆرانی هونەرێکە لە دەنگ و میلۆدییەوە سەرچاوە دەگرێ؛ دەبێ لەو شتانەوە دروست ببێ کە گوێمان لێیان دەبێ بێ ئەوەی هیچ قسەیەکیشمان بۆ بکەن، نەک لەو شتانەوەی کە گوێمان لێیان دەبێ قسەمان بۆ دەکەن.

ئەگەر ئەمە بکەینە میتۆدی دروستکردنی مۆسیقا و فەلسەفەی مۆسیقا، بێگومان لەو کاتەدا، بەهەمان شێوە مۆسیقایەک بەرهەم دەهێنین قسەمان بۆ بکا بێ ئەوەی هیچ وشەیەکیشی لە دەم هاتبێتە دەر، پرۆتێستۆ بکات و ناڕەزایی پێشان بدا بێ ئەوەی هیچ قانوونێکیش بەڵگەی لەلا پەیدا ببێ بۆ تۆمەتبارکردنی، دەسەڵات و قانوونەکان و زوڵمەکان ئیدانە بکات بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیش بکەوێتە دەست پۆلیس، تەنانەت دژی قەدەر و شەرع و سێکس و ژنیش قسە بکات بێ ئەوەی لە ئەنجامدا ناچار ببێ خۆی شاربەدەر

بکات و داوای مافی پەناهەندەیی لە وڵاتێکی ئەوروپا بکا.

لەم بارەوە مۆسیقاناسی ئەڵمان، ئەدۆرنۆ، پێی وایە مۆسیقا لەوانەیە شتگەلێکی تازە و نامۆی ئەوتۆ دابهێنێ کە نەک تەنیا دەوڵەت بەڵکو سەرجەم بەستێنە جۆراوجۆرەکانی تریش بیانەوێ سەرکوتی بکەنەوە.

بەڵام من پێم وایە، بەپێچەوانەوە؛ حکوومەتی دیکتاتۆر هەرگیز ناتوانێ هیچ بەڵگەیەکی قانوونی لەسەر تاوانی مۆسیقارِ وەدەست بهێنێ. ئەمەش چونکە مۆسیقا دەڵێ: من ئەو شتە ناڵێم و نەمگوتووە کە ئێوە وا تێ دەگەن گوتوومە و پێ دەچێ گوتبێتم، من مەبەستم شتێکی تر بووە.

کەواتە، مۆسیقا (ئەم جۆرە مۆسیقایە) تاقە هونەرێکە کە بتوانێ، تەمەندرێژ و بێ منەت، بێ ئەوەی سانسۆر بکرێت، لە ناو کۆمەڵگە تۆتالیتار و دیکتاتۆرەکاندا بمێنێتەوە. مۆسیقا هونەری دوارِۆژە، هونەری دوارِۆژی هەموومانە، هونەری دوارِۆژی هەموو ئەو میللەتانەی، ئەو هونەرمەندانەی کە نێڵی سەر ئەسکوردیان –بەتایبەتی لە کۆمەڵگە تۆتالیتار و فاشیست و دیکتاتۆرەکاندا– رِۆژ بەرِۆژ توندتر و توندتر دەبێ؛ بواری ئازادییان کەمتر، ژیانی خۆیشیان تەنگتر و تراجیدی تر.

ئەوەی ناگوترێ، مۆسیقا پێشانی دەدا. ئەوەی ناتواندرێ بگوترێ؛ مۆسیقا دەتوانێ دەری ببرِێ.

قانوون و دەوڵەت ناتوانن هیچ شتێک بەرامبەر مۆسیقا بکەن و تاوانباری بکەن: کەواتە مۆسیقا تاقە هونەرێکە کە دەتوانێ لەدەست دیکتاتۆرییەت و سانسۆر رِزگاری ببێ؛ تاقە هونەرێکە کە دەتوانێ ئازاد و ساف بمێنێتەوە. مۆسیقا لەم بارەیەوە بەراستی هونەری دوارِۆژە.

مۆسیقارِ دەتوانێ دەنگ بگۆرِێت و بیکات بە مانایەک، بێ ئەوەی پێویستیشی بە یەک وشە هەبێ؛ رِەهەندێکی فیکری ببەخشێتە میلۆدی بێ ئەوەی هیچ وشەیەکیشی بەکار هێنابێ.

٦٢٥ - ٥٥٠ پ. ز

دەوڵەتی میدیا: سەرهەڵدانی کتێبی پیرۆزی (ئاڤێستا) و دینی زەردەشت.

گاتاکان (گاث یان گاز، واتە بانگ)، سروودی دینیی زەردەشتی بوون، پێشیان گوتراوە (یەسنا) کە ژمارەیان (٧٢) یەسنا (سروود) بووە و کێشی بڕگەیی (هیجایی)یان هەبووە؛ ئامێری مۆسیقاییان دەگەڵ بەکار دەهات و لەلایەن مووغ و سرانبێژەکانەوە لە کاتی شادی و پرسەکاندا یان لە بۆنەکانی تردا، هەروەها لە ناو پەرستگاکانی خۆشیاندا بەدیار ئاگرەوە، بە ئاواز دەگوترانەوە.

ئەهلی هەق ئەمڕۆ بەو یەسنا دە بڕگەییانەی خۆیان کە لە جەمخانەکاندا بە ئامێری تەمبوورەوە دەیڵێنەوە، دەڵێن (یارسان).

دەوڵەتی میدیا، بەسەرپەرشتیی یەکەمین پاشای خۆی، دیاکۆ، سەرپەرشتیی ژیانی دینیی هۆزەکانی تریشی کردووە. بەشێک لە گەنجینە دۆزراوەکانی (زێوە) و (برۆنزەکانی لوڕستان) دروستکراوی میدییەکانن. میدیا زمانی خۆی هەبووە: زمانی میدیایی کە بە ئەلفابێی مێخی بووە.

٥٥٠ - ٣٣١ پ. ز

هەخامەنشییەکان (ئەخمینییەکان) دەوڵەتی میدیا دەخەنە ژێر رکێفی خۆیان و ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی دادەمەزرێنن؛ بەڵام دینی میدیاییەکان (زەردەشتی) باو دەمێنێتەوە. مێژوونووسە یۆنانییەکان، هیرۆدۆت (٤٨٦- ٤٢٠ پ. ز) و ئێگزەنەفۆن Xenophon باسی دەکەن: دوای میدیا، هەخامەنشی و ساسانیەکان هەمان دەستووری پۆشاک و شێوازی جلوبەرگی میدیەکانیان بەکار هێناوە.

دەوڵەتی میدیا کۆتایی پێ دێت، بەڵام زمان و کولتوور و دینی (زەردەشتی) و کولتووری زەردەشتی دەمێنێتەوە.

بەهەشت لە دینی زەردەشتدا، وەک بەهەشتی دینی ئیسلام نییە حۆری و

جـۆگـەی هـەنگوینـی لێ بێ، بەڵکو تەنیـا جـێگەی سـاز و ئاواز و گـۆرانـی و مۆسیقایە.

لە ئاڤێستـادا داوا کراوە کـە گاتاکان پێویستـە بە ئاوازەوە بخـوێندرێن ئەگینا نوێژ و دوعاکانیان قبووڵ نابێت.

هـیـــرۆدۆت (٤٨٦– ٤٢٠ پ. ز) لـەبـارەی قـــوربانـیـکردنـی (مـــاد)ەوە بـۆ خـواوەندەکانیـان دەڵـێ: «مـووغـەکان خۆیان سـەرپەرشـتیی ڕێورەسـمـەکانیـان دەکـرد و ســـروودی تایبـــەتـی خـــواوەندیـان دەچڕی». یـان دەڵێ: «مـــووغــە زەردەشـتییەکـان لە کـاتی نوێژدا ئاوازیان دەژەند و گۆرانییـان دەگوت». هـەر لـەم بارەیـەوە (یـۆنـاســـیس)ی نـووســـەری ســـەدەی دووەمـی زایـنـی، دەڵـی: «مـووغـەکـان ئەم سرووودانەیان لە ڕووی کتێبـەوە دەخـوێندەوە». "هاشـم رضـا، تاریخ مـطالعـات دینهـای ایرانی، چاپ دوم، ١٣٧١ش، چاپخـانەی خـواجـە، انتشارات بهجت، تهران. ص ٢٦ و ٢٨ هـەروەها: ص ٢٦ و ١٠٥–١٠٦"

٤٠١ پ. ز

سـەرۆک لەشکر و مێژوونووسی یۆنانیی دێرین، ئێگزەنەفۆن Xenophon لە کتێبی (ئاناباز Anabase )دا دەڵێ: «کاردۆخـەکان کاتێ دیتییان پاشـەنگ لە لەشکرەکە دابڕاوە و ژمارەی چەکدارەکانیش یەکجار کەمە، یەکسـەر کـەوتنە چڕینی جۆرە گۆرانییێک و بەپەلەپڕووزێ هەنگاوەکانی خۆیان بەلەزتر کرد».

بەمـە دەردەکەوێ کـە کاردۆخـەکـان مۆسـیقـا و گۆرانیی تـایبـەتی خـۆیان هەبووە. ئێگزەنەفـۆن، کـە لەو گـۆرانیـیـانەی کـاردۆخــەکـان هیچ تـێ ناگـا و ناشــزانێ ســەر بـەکـام نەزم و ریتـمی گـۆرانین، نـاتوانێ هـیچ ناوێکیـان بۆ بدۆزێتـەوە. بەڵام دەردەکـەوێ کـە کـاردۆخـەکـان لەو کـاتەدا گـۆرانیـیـەکی تایبەتییان بەدەم شەڕ و شۆڕەوە چڕیوە.

٣٠٠ پ. ز

لە سـەردەمی میدیاوە تا داگیرکرانی کوردستـانیش لـەلایەن ئیسـلامـەوە،

گۆرانیی (هۆره) بۆ ستایشکردنی ئاهورامەزدا لە مەڵبەندی هەورامان و کرمەشان و ئیلام و لوڕستان گوتراوە. هاوزەمان (گاتا) زەردەشتییەکانیش باو بوونە کە لە سەردەمی دەرکەوتنی زەردەشت پێغەمبەرەوە دەرکەوتوون.

٣٣١ پ. ز – ٢٢٦ زاینی

فەرمانڕەوایەتیی یۆنانییەکان لە کوردستاندا بۆ ماوەی نزیکەی ٥٥٧ ساڵ

لە ٣٣١ پ.ز بەملاوە، واتە لەو کاتەوەی ئەسکەندەری مەقدۆنی لە شەڕی ئەربێلا لە هەولێر داریووش پاشای هەخامەنشی (ئەخمینی) دەشکێنێ، کوردستان لە ژێر دەسەڵاتی یۆنانییەکاندا لە کولتووری یۆنانی ئاو دەخواتەوە. زمان و کولتوور و تەنانەت فیزیک و هونەریشمان دەکەونە بەر زەبری زمان و دین و فیزیک و کولتووری یۆنانییەکانییەوە. یۆنانییەکان بەشێک لە پەرستگە زەردەشتییەکان تێک دەشکێنن، کولتووری خۆیان دەسەپێننە سەر کوردستان.

٢٢٦ – ٦٥١ ز.

سەردەمی فەرمانڕەوایەتیی ساسانییەکان لە کوردستاندا

ساسانییەکان لە ساڵی ٢٢٦ی زاینیدا حوکم دەگرنە دەست و یۆنانییەکان دەردەکەن؛ فەرمانڕەوایەتیی کوردستان و بەشێک لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەگرنە دەست؛ دینی خەڵک لەو سەردەمەی ساسانییەکاندا زەردەشتی و مەسیحی و مانایی و جوولەکە بوو.

درەوشانەوەی ناوی دوو پەیکەرتاشی ئەو سەردەمە: (شاپوور) و (فەرهاد)، نەخشەکانی تاقوەسان بەقەد پاڵی شاخی بێستوونەوە لە کرماشان، یادگاری ئەو زەمانەن.

– تۆما بوا، کوردناسی فەرەنسی، دەڵێ: لە سەردەمی ساسانییەکاندا کورد موزیکی یەکجار بەرزیان هەبووە، تەنانەت کاری کردووەتە سەر دراوسێکانیشی. لە چەنگ ژەنیندا ناودار بوون، زۆر ئاوازیان هەبووە.

٣٠٠- ٤٠٠ ز.

- المسعودي (٩٥٧ ز) له (مـروج الذهب)دا دەڵی: کـوردانی مـەسـیـحی، له نێوان مـووسڵ و چیـای (جـودی)دا دەژیان. ئەمـەش بەڵگەی ئـەوەیه کـه تا هـەر دوو سـەدەکـانی چـوارەم و پێنجـەمی زاین، ئـاینی زەردەشـتی لەو ناوچـانەی جـزیر و بۆتان و خـۆرئاوای زنجـیره چیـای زاگـرۆسـدا هێنده بڵاو نەبووەتەوە.
توفيق وهبي: الاثار الكاملة، الجزء الاول، منشورات بنكەی ژين، مطبعة شڤان، السليمانية ٢٠٠٦، ص ٥٧



٦٣٤ ز. – ٦٤٤ز

هێرشی موسڵمانە عەرەبەکان بۆ بڵاوکردنەوەی دینی ئیسلام لە کوردستاندا. لە سەردەمی چوار خەلیفەکەی ئیسلامدا، کوردستان وردە وردە دەکەوێتە بەر هێرش و فەرمانڕەوایەتیی ئیسلام: ئەبوبەکر (٦٣٢)، عومەر (٦٣٤)، عوسمان (٦٤٤)، عەلی (٦٥٦).

کوردستان دەکەوێتە ژێر زەبری کولتووری ئیسلامەوە و قۆناغێکی جیاواز لە کولتووری کورد دەست پێ دەکات. ئیسلام زۆربەی پەرستگا و ئامێرە مۆسیقاییەکان و شوێنەوارە کولتووری و دینییەکانی کوردستان وێران دەکات و (مز – گە – فت)ەکان دەکات بە (مەس – جە – د).

٦٦١ – ٧٥٠

ماوەی خەلافەتی موسڵمانی ئەمەوییەکان لە کوردستاندا

٧٠٦– ٧٤٣

مۆسیقاژەنی کورد، ئیبراهیم کوڕی ماهان کوڕی بەهمەن (الموصلی)؛ یەکێک لە ناودارترین گۆرانیبێژەکانی سەردەمی ئەمەوی لە دەوروبەری (٧٠٦– ٧٤٣ ز.)، خزمەتێکی گەورەی مۆسیقا و گۆرانیی ئیسلام و عەرەب دەکات: یەکەمین کۆنسێرڤاتواری ئیسلامی دادەمەزرێنێ، پاشان کوڕەکەی، ئیسحاق، پەرەی پێ دەدا. الحصري لە (جمع الجواهر في الملح و النوادر) باسی کردووە.

ماوەی خەلافەتی عەباسی لە کوردستاندا

٧٥٠ – ١٢٥٨

خەلافەتی عەباسییەکان، پایتەختیان بەغدا، دەسەڵات لە ئەمەوییەکان وەردەگرن: کوردستان و بەشێکی فراوانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە.

٧٤٠- ٨١٠

ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم کوڕی ماهان کوڕی بەهمەن (الموصلي)، یەکێک لە ناودارترین گۆرانیبێژەکانی سەردەمی عەباسی لە دەوروبەری (٧٤٠- ٨١٠). لە یەکێک لە شاگردەکانی لای باوکی خۆیەوە، بەناوی (زەلزەل) فێری عوود بووە، لە (ئاتکە)ی کچی (شەزا)وە فێری گۆرانی بووە. لە هەشتا ساڵی مردووە. "الحصري" لە "جمع الجواهر في الملح والنوادر" باسی کردووە.

٧٧٥

خەلیل کوڕی ئەحمەد ئەلفەراهیدی (٧١٨ – ٧٩١) کێشە عەرووزییە عەرەبییەکان بۆ مۆسیقای شیعری عەرەبی دادەمەزرێنێت و ئەم کارە کاریگەریی دەبێ بەسەر ئەوەی کە لەمەولا شاعیرانی کورد بە کێشی (بە مۆسیقای) عەرەبی شیعر بنووسن و واز لە کێشی خۆماڵیی کوردی بهێنن.

٨٠٠

زەریاب (واتە ئەو کەسەی زێڕ دەدۆزێتەوە) گۆرانیبێژ و مۆسیقاژەنێکی کورد بووە (بەغدا ٧٨٩- قورتوبە ٨٥٧)، کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی نافیع، لە کاتی گەنجیەتیدا سەری خۆی هەڵگرت چووە بەغدا و لەوێ بووە شاگردی ئیسحاق مووسڵی، تا وای لێ هات لە دیوەخانی هاروونە ڕەشید گۆرانی بڵێت و مۆسیقا بژەنێت و شۆرەتێکی مەزن پەیدا بکا. ئەمە مامۆستاکەی خۆی تووشی حەسوودی کرد، زەریاب (بەغدا ٧٨٩- قورتوبە ٨٥٧) بۆیە ناچار بوو سەری خۆی هەڵبگرێت و بچێتە ئەندەلووس، کە ئەو کاتە عەبدوڕەحمان دووەم خەلیفەی ئەوێ بوو. خەلیفەی ئەوێ سەرسامی دەنگ و مۆسیقاکەی، ڕێگەی پێ دا یەکەمین قوتابخانەی گۆرانی و مۆسیقا لەوێ بکاتەوە. مێژوونووسەکان دەڵێن: زەریاب (بەغدا ٧٨٩- قورتوبە ٨٥٧) موەشەحاتی ئەندەلووسیی داهێناوە، کە لە ڕووی سیستەمی قافیەوە دەقاودەق لە حەیرانی دەشتی هەولێر دەچێ. هەر ئەویش پێنجەمین ژێی بۆ

عـوود زیاد کـردووە، جگە لە داهێنانـی چەند مـەقـامـێک کە پێشـتـر نەبوونە.
هەنـدێ مـێـژوونووس ڕایان وایـە کـە هـەر ئەویش مـۆسـیـقـای فـلامـینکۆی دامـەزراندووە. زەریاب لـە قـورتـوبە لـە سـاڵی ٨٥٧ کـۆچـی دوایـی کـردووە (هەندێ سەرچاوەش دەڵێن لە ٨٤٥ مردووە).

مێـژوونووس و مۆسـیـقـاناسـی فەرەنسی، ئەندرێ کلۆت باس لە کوردبوونی زەریاب دەکات و ڕۆڵی لە مێژووی مۆسیقای ڕۆژهەلاتدا.
Andre Clot: Ziryab un Kurde Celebre, in Les Kurdes dans l actualite, Pub. de l Institut Kurde de Bruxelle, Bruxelle: 2003, P. 16-17.

٨٩٣

"ابن خـرداذبة" ٨٩٣ ز – لە کـتـێـبی (اللهـو والملاهي) باسی مـۆسـیـقـا و گۆرانیی کوردان دەکا.

سەردەمی یەکەم میرنشینی کوردەکان
٩٢٩ –١٢٥٠

لە کوردستان چەندان میرنشینی کورد حوکمی سەربەخۆیان هەیە:

– حەمدانییەکان (٩٢٩ –١٠٠٤) لە جەزیرە؛ شەدادییەکان (٩٥١ –١١٧٤) لە گەنجەی رۆژئاوای باکوری کوردستان؛ مەروەندییەکان (دەوڵەتی دۆستەکی: ٩٩٠ – ١٠٩٦) لە دیاربەکر.

– گۆرانیی زەمبیلفرۆش لە سەردەمی دەوڵەتی دۆستەکیدا گوتراوە.

– "المسـعودی" لە کـتـێبی مـروج الذهب، ل٢٢١، لە سـالانی نێـوان (٩٥٧– ١٠٣٠)، باسی بلوێر و شـمـشـاڵی کـردووە لای شـوانە کـوردەکـان، وە چۆن بلوێریان بۆ مەڕەکانیان ژەنیوە بۆ گردکرنەوەیان.

– گەلێک لە شارەزایانی مۆسیقا و ئامێری مۆسیقاناسە ئەوروپییەکان، لەوانە (فـرانسوا رێنێ ترانشیـفۆر francois- Rene Tranchefort) لە کـتـێبی «ئامێرە مۆسـیـقاییـیەکـان لە جیـهـاندا -Les ins truments de Muiquedans Le

mond » کـه بە فـەرەنسی لە سـاڵی ١٩٨٠ لە پاریس لە دەزگـای seuil چاپ کـــراوە، لە لاپەڕە (١٠٠-١٥٩-١٦٠) بنەچەی گـــەلێک لە ئامـــێـــرە مـۆسـیـقـاییـیـەکـانی رۆژهەڵات، وەک (تـەنبـوور) و (بـوزک/ بزخ Bazuq) دەگێڕێتەوە بۆ کورد، دەڵێ کە لە سەرەتادا (لە سەردەمی عەباسییەکاندا) کورد ئەو ئامێرە مۆسیقاییانەی داهێناوە.

٩٧٠.

ژیان و بەرهەمەکانی شاعیری کورد باباتاهیری هەمەدانی (٩٣٥ - ١٠١٠) بە لەهجەی لوڕی.

٩٩٠.

کۆنترین سەرچاوەی گەڕیدە موسڵمانەکان باسی گۆرانی و مۆسیقای کوردیی کردبێت برێتییە لەو گرووپە نووسەرانەی کە بە (اخوان الصفا) ناودارن و لە شاری (بەسرە) لە سەدەی دەیەم واتە لە ساڵانی (٩٠٠)، پەنجا و یەک نامیلکەیان لەبارەی زانستەکانەوە نووسی (بڕوانە: دە بور: دائرة المعارف الاسلامیة، مادەی اخوان الصفا، ل ٥٢٧- ٥٢٩. اخوان الصفا لە ساڵانی (٩٠٠) لە یەکێک لە نامیلکەکانی خۆیاندا باسیان لە مۆسیقا و گۆرانیی کوردی کردووە.

١٠٠٠.

- دەرکەوتنی مۆسیقای پیرۆزی ئەهلی هەق.
- موبارەک شا، ناسراو بە (شا خوشین) لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا وەدیار کەوتووە، بە تەنبوور گۆرانیی پیرۆزی ئەهلی هەقەکانی گوتووە و تیپێکی فراوانی مۆسیقاژەنی ئەهلی هەقی هەبووە، لە ناوچەکانی کرمانشان و ئیلام و هەورامـاندا هەبووە. (٩٠٠) ئاوازی لەبارەی دینی (یاری)یەوە داناوە.
- مۆسیقاژەنەکانی ئەهلی هەق: تەمیر، یار محەمەد، پیر کەرەم، ڕەزا

شاوەیس، هەمزە، عەبدوڕەحمان.. کە لە کۆشکی پاشا سترانیان دەچڕی و ناویان لە (شانامەی هەقیقەت)دا هاتووە.

- لە سەردەمی دەوڵەتی دۆستەکی (٩٩٠ – ١٠٩٦) واتە مەروەندییەکان (٢٧٢– ٤٧٨ی هیجری) لە ناوچەی دیاربەکر و جەزیرەدا بایەخ بە گۆرانی و مۆسیقای کوردی دراوە.
- خوارزمی لە ساڵی ٩٩٧، لە کتێبی "مفاتیح العلوم"، ل ٢٣٦، هەروەها "البیهقی"، لە ساڵی ١٠٧٧، لە کتێبی "المحاسن و المساوي"، ل ٣٦٧ باسیان لە مۆسیقا و گۆرانیی کوردی کردووە و ناوی ئامێرەکانی وەک زومڕ و مزمار و دووزەلە و زوڕنایان کردووە لای کورد.
- تۆما بوا، ڕۆژهەڵاتی فەرەنسی، لە ئینسیکلۆپیدیای ئیسلامی (چاپە فەرەنسییەکەی) دەڵێ کە کورد دووزەلەیان لە ئێسقانی باڵندە دروست کردووە.

١١٦٣ –١٠٧٣

شێخ ئادیّ، ڕێبەری مەزهەبی یەزیدی؛ گومبەز و پەرستگەکان و لالش پڕ دەکات لە نەخش و ڕۆلیێفی پەیکەرتاشی و ئاواز و تەمبوور و ئامێرەکانی تریشمۆسیقا.

١١٥٠

سوڵتان سنجاری سەلجووقی (ئوستانی کوردستان) ئیقلیمی جیبال بۆ کوردەکان جیا دەکاتەوە و پایتەختیان دەکاتە شاری (بەهار). کوردستان بۆ یەکەم جار دەبێتە ئوستانێکی سەربەخۆ و ناوێک لەسەر نەخشەی ئیداریی ڕۆژهەڵاتدا.

١١٠٠

بڵاوبوونەوەی سروودگەلی (یارسا)کانی ئەهلی هەق.

- بابا ناعووس و باوە سەرهەنگ، دوو کەلامخوێن و تەنبوورژەنی ناوداری

ئەهلی هەقەکان بوونە. دوو مەقام بەناوی ئەوانەوە ناو نراون (مەقامی بابا ناعووس) و (مەقامی باوە سەرهەنگ).

– القزوینی: اثار البلاد ، ل ٤٨٥، باس لە شایی و هەڵپەڕکێ و گۆرانی دەکا لە شاری هەمەدان.

١١٧٦

ناودارترین میری دەوڵەتی دۆستەکی (نصـر الدولة الكردي) بووە کە لە (١٠٢٤ جڵەوی فەرمانڕەواییی گرتە دەست. بە شەوبێری و جاریە و کەنیزەک و ڕابواردنەکانیەوە، زۆر ناودار بووە و (٣٦٠) کەنیزەکی هەبووە.

١١٨١

فارقی لە کتێبی (تاريخ الفارقی)، ل ١٧ و ١٢٢ و ١٧٠، لە ساڵی ١١٨١ باس لە میری کورد، "نصـر الدولة المرواني" و خێزانەکەی دەکا کە چۆن ئاهەنگیان لە شاری میافارقین و دیاربەکر ساز داوە و گەمە و گۆرانی و سەمایان تێدا گێڕاوە.

جگە لە فارقی، گەڕیدەیەکی تریش بەناوی "ابن كثير: البداية والنهاية"، ل٩٣ باسی لە میری کورد، "نصـر الدولة المرواني" کردووە و دەڵێ «ئەو گۆرانیبێژانەی دەهاتنە ئاهەنگەکانی، پێنج هەزار دیناری دەدانێ، بەڵام ئەو گۆرانیبێژانەی کە بەردەوام لە ئاهەنگ و شەوبێری و ڕابواردنەکان ئامادە دەبوون ئەوا دوو سەد هەزار دیناری دەدانێ». فارقی دەڵێ کە میری کورد، "نصـر الدولة المرواني" جاریەیەکی (کەنیزەکێکی سەماکەری) لە وڵاتی میسرەوە هێنابوو بۆ میافارقین –نزیک دیاربەکر– ناوی (فەرجیە) بوو کە ئامێری عوودی دەژەنی.

فارقی دەڵێ کە میری کورد، "نصر الدولة المرواني" لە میافارقین زۆر حەزی لە گوێگرتن لە شیعرەکانی "ابی نواس" بووە.

١١٩٠

– شاعیرێکی جوولەکەی ئیسپانی Yehuda al - Harizi لە ساڵانی ١١٩٠، سەر لە هەولێر دەدات و لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناونیشانی (مەقامات Meqamat) کە لە ١٨٨٣ لە Gottingen چاپ کراوە باسی دەکات، ناوی هەموو ئەو شاعیر و شەخسیاتانەش دەهێنێت کە لەو سەردەمەدا لە هەولێر ژیاون.

میرنشینی ئەیوبییەکان لە هەولێرەوە تا میسر و شام

١٢٥٠–١١٦٩

میرە ئەیووبییەکان زۆر حەزیان لە مۆسیقا و گۆرانی و ئاهەنگ و شەوبێری بووە. ابو الفداء: مختصر کتاب البلدان (١٣٣١ م)، ل١٧٨ بەفراوانی باسی دەکا، بەتایبەتیش ناوی میری ئەیووبی (الملك الافضل) دەهێنێ کە شەیدای دەنگی گۆرانیبێژێکی ژن بووە بەناوی (عەجیبە) کە شەوان هاتووەتە لای و بە ئامێری (چنگ) مۆسیقای بۆ ژەنیوە.

– "الحنبلي: شفا القلوب"، ل ٣٨١ لەگەڵ "ابن العدیم: بغیة الطلب"، ل٩٨٣، باسیان لە میرە ئەیووبییەکان کردووە کە زۆر حەزیان لە مۆسیقا و گۆرانی و ئاهەنگ و شەوبێری بووە. باس لە گۆرانیبێژێکی ناوداری ئەیووبییەکان دەکا کە ناوی (ابوالعباس الهذباني الكوردي) بووە و ناسراو بووە بە سەلاحەدین ئەربیللی و لە (١٢٣٣) واتە لە سەردەمی میر (المغیث الايوبي) ژیاوە و هەر لە مەجلیس و دیوەخانەکانی ئەویش ماوەیەک گۆرانیی گوتووە.

١٢٢٠

– موزەفەرەدین گۆکبەری، نوێنەری سەلاحەدینی ئەیووبی لە هەولێر، هەندێکیش پێی دەڵێن سوڵتان مورەخەر (کە لە ١٢٣٣ کۆچی دوایی کردووە و ماوەی فەرمانڕەوایەتییەکەی لە هەولێر بریتی بووە لە ١٢٢٨– ١٢٣٣)، دوای ئەوەی لە قودس یادکردنەوەی مەسیح و ئاهەنگەکانی مەسیحییەکان دەبینێ؛

کاتێ لە شەڕی قودس دەگەڕێتەوە هەولێر، لە ساڵی ١٢٢٠ بۆ یەکەم جار لە مێژووی هەموو وڵاتانی عەرەب و ئیسلامدا یادکردنەوەی ڕۆژی لەدایکبوونی پێغەمبەر دەکاتە نەریتێک: لە هەولێر و لە سەرتاپای جیهانی ئیسلامدا هەر لە مانگی سەفەرەوە تا سەرەتای رەبیعولئەوەل بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەر ئاهەنگ ساز دەکەن؛ مۆسیقا و گۆرانی دەچڕن. چەندان هەزار درهەمی زێڕی دەدایە هەرچی مەلایەک لە ئەفریقیا، لە ئاسیا مەولوودنامەی بنووسیایە. بەم شێوەیە مەولوودنامە دەبێتە ژانرێکی ئەدەبی و سازدانی ئاهەنگ و مۆسیقا و گۆرانییەکانیش، بێگومان، کاریگەرییەکی بەزەبر دەنوێنن بەسەر پەرەسەندنی مۆسیقا و مەقامات و گۆرانی لە وڵاتانی عەرەب و ئیسلامدا، کە قۆریاتی تورکمانیش پاشان لەمەوە سەرهەڵدەدا.

لە ژێر کاریگەریی ئەم بایەخدانەی سوڵتان موزەفەر بە ئاهەنگی مەولوودنامە و مەقامات، یەکێک لە یەکەمین ئەو مۆسیقاناس و نووسەرانەی کە باسی لە مەقامات و ئاواز و گۆرانی کردبێت لە سەردەمی دوای عەباسییەکاندا، لە ساڵی ١٣٢٨؛ بەدرەدین ئەربیللی (١٢٨٧- ١٣٥٤)، شاعیرێکی کوردی هەولێری بووە و لە بەغدا نێژراوە، کتێبێک لەبارەی ئاواز و گۆرانی و مەقامەکان بە ناونیشانی "جواهر النظام في معرفة الانغام" بە زمانی عەرەبی دەنووسێ.

ئەم ڕاستییانە ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە کورد، بەتایبەتیش شاری هەولێر و ڕۆڵە ناودارەکەی، سوڵتان موزەفەر، چ ڕۆڵێکی گەورەی، لە بڵاوکردنەوەی مۆسیقا و گۆرانیدا بەناو وڵاتانی ئیسلامدا هەبووە؛ ئەوەش دەسەلمێنن کە لەو سەردەمەدا مۆسیقا و گۆرانی لە هەولێر و لە کوردستاندا لە چ ئاستێکی گەشانەوەی خۆیدا بووە: هەر لە ئەنجامی ئەمەشدایە کە مۆسیقاناس و هونەرمەندی مەزنی وەک زەریاب، دواتر، لەم کولتووورە دەوڵەمەندەی کوردستانەوە بەوەلەد دێن.

– ئیبن موستەوفی، هاوڕۆژگاری سوڵتان موزەفەر، باسی لەوە کردووە کە سۆفییە کوردەکان (متەسەوفەکان) لە هەولێر، بۆ کاتی زیکر مۆسیقایان

بەکار هێناوە؛ هەروەها باسی بەکارهێنانی بلوێر دەکا لە هەولێر.

– ئیبن خەلەکان لە ساڵی ١٢٨٢ لە وفيات العيان، ل١١٨هەروەها النعيمي: الدارس في تاريخ المدارس (١٥٢٠ م)، ل١٥٧ باس لەوە دەکەن کە لە سەردەمی سوڵتان موزەفەر گۆگبەریدا گۆرانیی دینی و دەف لێدان هەبووە، هەروەها سروود و گۆرانی لە ڕۆژی لەدایکبوونی پێغەمبەردا گوتراوە.

١٢٠٠

– کتێبی "الف ليلة وليلة" باسی ئاهەنگ و گۆرانیی کوردی دەکا؛ بەرگی یەکەم، ل ٦٠٩ – ٦٢٣، بەرگی دووەم، ل ٢٤٢ – ٢٩٥.

– نیزامی گەنجەوی (؟– ١٢١٧ز) کە دایکی کورد بووە، هەروەها خانای قوبادی (١٧٠٠– ١٧٩٥) لە شیرین و خوسرەوەکەیاندا ناوی ٣٠ لە ئاوازە کوردییەکانیان بردووە.

شمس قيس رازی (١٢١٧ ز) لە (المعجم في معايير اشعار العجم) لە باسکردنی مۆسیقای کوردیدا ئاوازێکی شی کردووەتەوە کە ناوی (هەورەمان) بووە.

– لە (١٢٠٦) جەنگیزخان (تورک و مەنگۆل) وڵاتی ئێران داگیر دەکەن.

١٢٥٠

سوڵتان ئیسحاق، (لەدایکبووی ساڵی ١٢٢٩ ز)، گەورە موتەجەللیی ئەهلی هەق، کە خۆیشیسترانبێژ و مۆسیقاژەنێکی ناوچەی کرمانشان و ئیلام و لوڕستان بووە لە ناو ئەهلی هەقەکاندا، بڕیار دەردەکات: حەفتا و دوو ئاوازەکەی ئەهلی هەق بنووسرێنەوە.

١٢٥٦

"ابن الشعار الموصلي" لە "قلائد الجمان" لە ساڵی ١٢٥٦، ل ٢٢ ٥ دەڵێ: زۆر لە مۆسیقارە کوردەکانی وەک "صدقه بن محمد بن القاسم بن محمد بن

علی"، ناسراو بە "ابوالبر الاربیلی"، کە ئاوازدانەر و مۆسیقارێکی شارەزای هەولێر بووە و لە ساڵی ١٢١١ ژیاوە، ئاوازی بۆ گۆرانیبێژەکان داناوە و هۆنراوەی گۆرانیی بۆیان نووسیوە. ئەهلی تەرەب گۆرانییەکانی ئەویان وەرگرتووە و لە مەجلیسەکانی خۆیان گوتوویانەتەوە.

٢٠ / ٢ / ١٢٥٨

هۆلاکۆ، نەوەی جەنگیزخانی مەنگۆل، بەغدا دەڕووخێنێ و کۆتایی بە عەباسییەکان (٧٥٠ – ١٢٥٨) دێنێ.

کوردستان وردە وردە دەکەوێتە ژێر دەستی هۆلاکۆ

١٣٠٠

مۆسیقاژەنی ناوداری کورد، عەبدولقادر مەراغەیی (١٣٥٤ – ١٤٣٤ یان ١٤١٩؟)، کتێبێکی بەناونیشانی (جامع الالحان) نووسیوە، لەوێدا باسی گۆرانی و ئامێرەکانی مۆسیقای کوردی دەکا.

– جەلالەدین کوڕی عومەر خدری داسنێی کوردی (؟– ١٣٩٧) کتێبێکی بە زمانی عەرەبی لەبارەی مۆسیقا نووسیوە بەناونیشانی "الکنز المطلوب في علم الدوائر و الظروب"، لەوێدا باسی گۆرانی و مۆسیقای کوردی دەکا.

– "المقریزی: المقفي الکبیر" لە (١٤٤١)، ل١٠٥ دەڵێ: «"ابراهیم بن اسماعیل بن یونس، ئیسحاق، الهکاری الاربلی"، ناسراو بە "ابراهیم الفقیسة" کە لە ساڵی ١٢٩٩ لەدایک بووە مۆسیقاژەنێکی دیاری ئەو زەمانە بووە».

١٣٢٨

هونەری مەقامات و قۆریات لە هەولێر هەبووە. بەدرەدین ئەربیللی (ئەبومەعالی بەدرەدین کوڕی محەمەد کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەد ئەربیللی)، خەتیب و شاعیرێکی هەولێری بووە و لە بەغدا نێژراوە (١٢٨٧– ١٣٥٤)، کتێبێک لەبارەی مەقامەکانی ناو هەولێر بە ناونیشانی (جواهر النظام في معرفة الانغام) بەزمانی عەرەبی دەنووسێ، لە گۆرانی و ئاواز و مەقامەکانی

ناو هەولێر دواوە. عباس العزاوی ئەم کتێبەی، بەناوی (ارجوزة الانغام) لە نێو کتێبەکەی خۆیدا (الموسیقی العراقیة في عهد المغول والترکمان) لە ١٩٥١ لە بەغدا دووبارە چاپ کردووەتەوە.

بەشێکی کتێبەکەی (ئەبومەعالی بەدرەدین کوڕی محەمەد کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەد ئەربیللی)، بە شیعر نووسیوە کە بریتییە لە ١٠١ بەیت بە زمانی عەرەبی. مەقامە بنچینەییەکانی دەسنیشان کردووە و دەڵێ:

و اعلم بان الرست اصل الكل

عنه تفرعت بحكم العقل

ئنجا سێ مەقامی تریش (زۆرکەند و عێراق و ئەسپەهان) بە بنچینەیی دادەنێت و پێی وایە کە هەموو مەقامەکانی تر لەم چوار مەقامەوە دروست بوونە و ژمارەیان دەگاتە ١٢ مەقام.

١٣٤٠

"العسقلانی" لە "الدرر الكامنة"، ل ٣٥٥ و ١٦٤ لە ساڵی ١٤٤٨ ناوی دوو مۆسیقاژەن دەبات لەو زەمانەدا، یەکەم: "احمد بن یحیی بن محمد البكری شمس الدین الشهرزوری" کە لە ١٣٤٠ ژیاوە و نووسەریش بووە؛ لەگەڵ "جمال الدین ابوسعید عمر بن خضر بن جعفر زاده الدشتی یان الداسنی الكوردی" کە لە ١٣٤٧ ژیاوە و کتێبێکیشی بە ناوی "الكنز المطلوب في الدوائر و الضروب" بە دەسنووس لە کتێبخانەی نیشتمانیی سویسرا پارێزراوە.

١٣٤٢

– کتێبی پیرۆزی (مەسحەفا ڕەش)ی یەزیدییەکان.

– ڕۆژهەڵاتناسی ڕووس، پیتەر لیرخ، لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا لەبارەی کورد، ئاماژە دەدات بە گۆرانییە دینییەکانی یەزیدییەکان کە لەسەر قەبری شێخ ئادیٚ دەیخوێنن کە لە ١١٦٠ مردووە.

١٣٥٦ –١٤٢١

مەلا پەرێشان، شاعیری مەڵبەندی هەورەمان.

١٣٧٤

"الامـــام النـواوی: الاذکـــار – للامـــام النـواوی"، دەسـنووســـێکە بـە زمـــانی عـەرەبی، "خـضـر بن عمـر الکویسنجـقلی" نووسـیـویەتیـەوە، لە کـتـێـبـخـانەی جەلیزادان، واتە لە کتێبخانەی مەلای گەورەی کۆیە دەکاتە باوکی مەسعوود محەمەد لە کۆیە پارێزراوە؛ دەسنووسەکە لەبارەی گۆرانی و مۆسیقای کوردی و مـەقـامـەکـانی ڕۆژهەڵات دەدوێ، هـەروەها باسی چەندین مـۆسـیـقـاژەنی پایەداری سـاڵانی ١٢٠٠ تا ١٣٧٤ دەکات، لەوانە مـۆسیـقـاژەنی ناوداری ئەو زەمـانە: "الجـمـال المشـرقی – خـضـر بن عـمـر" کـە هـەر خـۆیشی کـتـێـبـە دەسنووسـە عەرەبیـەکەی، بەخـەتی خۆی نـووسیـوەتەوە. شایانی باسـە، دکتـۆر مـسـتـەفـا جـەواد کـە مـۆسـیـقـاناس و ڕووناکـبـیـرێکی گەورەی هونەرمـەندی بەغدایییە، لە سـاڵانی حەفتـاکان لە ڕۆژنامـەی (الثورة) لە وتارێکیدا لەبارەی مەقاماتی عێراقی، ئەم کتێبە و نووسەرە کوردەکەی، زۆر بەرز نرخاندووە. ئەم دەسنووسە شایانی ئەوەیە دکتۆرای مۆسیقای پێ وەربگیرێت و تەرجەمەی کوردی بکرێت.

١٣٩٦

ئەفسـەری هەنگاری (کە د. جـەمال نەبەز بە زێڕنگەری باڤاری ناوی دەبات) جـۆهان شـیلتـبێـرژەر Johann SCHILTBERGER لە سـاڵانی ١٣٩٦ –١٤٠٢ هاتووەتە کوردسـتـانی تورکیای ئەمڕۆ. گەشـتنامـەیەکی لە سـاڵی ١٤٧٣دا بە زمـــانی ئەڵمـــانی بڵاو کـــردووەتـەوە و لەوێدا ناوی کـــوردی بردووە و باسی گۆرانیی کوردی دەکا. باسی مـەڵاتییە و سیڤاس و ئەرزنجـان و قۆنیا دەکا. لە سـەردەمی قـەرەقـۆینلوودا بـە دیل گیـراوە. بە رای د. جـەمال نەبـەز، لەوانەیە کۆنترین سەرچاوەی ئەڵانی بێت کە ناوی کوردی تێدا هێنراوە.

١٤٠٦ –١٤٧٠

مۆسیقاژەنی ناوداری کورد جەمالەدین ماردینی.

١٤٠٥

ئیبن خەلدون لە پێشەکییەکەی ساڵی ١٤٠٥، ل ٣٣٥، باسی لە مۆسیقا و گۆرانیی کوردی کردووە و ناوی ئامێرەکانی وەک زومڕ و مزمار و دووزەلە و زوڕنای کردووە لای کورد.

تۆما بوا، ڕۆژهەڵاتی فەرەنسی، لە ئینسیکلۆپیدیای ئیسلامی (چاپە فەرەنسییەکەی) دەڵێ کە کورد دووزەلەیان لە ئێسقانی باڵندە دروست کردووە.

١٤١٧

ئیبن خەلدون لە کتێبی "وفیات العیان"، لە ١٢٨٢، هەروەها حەنبەلی لە "شذرات الذهب" لە ساڵی ١٤١٧ باس لە بەکارهێنانی ئامێری دۆڵ و تەپڵ دەکەن لە هەولێری ساڵانی ١٢٨٢ و ١٤١٧.

١٤٤٦

بووژانەوەیەکی ئەدەبی و هونەری بەدیالێکتی گۆران لە سای میرنشینی ئەردەڵانەکاندا: شاوەیس قولی ١٤٠٧ – ١٤٨٢، عالی قەلەندەر ١٤٣٤–١٥١٢.

١٥٠٠

لە سەرەتای سەدەی شازدەمدا، لە دەوروبەری ساڵی ١٥٠٠دا، لە دەوروپشتی کێوی شنرویێ لە نزیک شارۆچکەی هەڵەبجە، پەخشانەکانی (سروودی یارسان) سەرهەڵدەدەن کە تێکەڵەیەکی پەخشان و شیعرن بە دیالێکتێکی تێکەڵی هەورامی – لەکی – کرماشانی نووسراون، پێیان



تابلۆیەکی شەرەفنامە کە تێیدا نیشان دراوە لەو سەردەمەدا
ئامێری مۆسیقای جۆراوجۆر بەکار هاتووە

دەگوترێ «دەفتەر»، ناودارترینیان بریتییە لە «سەرەنجام»؛ قسەکانیش پێیان دەگوترێ «کەلام». زۆربەی بۆچوون لەسەر ئەوە رێکن کە سوڵتان ئیسحاق نووسیونی و ئیمامی عەلی بە رەمزی خوا دەزانێ؛ بۆیەش بە پەیڕەوکارانی گوتراوە «عەلی ئیلاهی»، بە مەزهەبەکەشیان دەگوترێ «ئەهلی هەق».

لە بەشی ٥، سروودی یارساندا هاتووە: خوا ئارەزووی کرد کە تیشکی زاتی خۆی لە بەشەردا بنوێنێ.

– ئیدریسی بدلیسی ١٤٥٢– ١٥٢٠، بەشێک لە کتێبەکانی لەبارەی پزیشک و گیانەوەرناسی و گەردوونناسی، بە فارسی و ئەوانی ریشی بە تورکی نووسیون. (رسالة في اباحة الاغاني) بە فارسیی نووسیوە.

١٦٠٠ – ١٥٣٠

عەلی هەریری، شاعیری مەڵبەندی هەریر لە کوردستانی تورکیا.

١٥٩٧ – ١٥٩١

میر شەرەفخانی بەتلیسی، میری بەتلیس، لە ١٥٩١ دەست دەکات بە نووسینی کتێبی (شەرەفنامە) کە لە ١٥٩٧/٨/٤ لە نووسینی تەواو دەبێ.

لە نێو میناتۆرەکانی ژمارە ١ و ٦ و ٩دا وێنەی چەند ئامێرێکی مۆسیقایی کێشراون، لەوانە: بووق و کەڕەنا و تەمبوور یان ساز. ئەم دیاردەیە دەیسەلمێنێ کە لە چوارچێوەی میرنشینی بەتلیسدا لە دیوەخانی شەرەفخاندا بەشێوەیەکی گشتیش لە کوردستاندا مۆسیقا خولیایەک و گۆرانی هونەرێکی بەرەوەج بووە. عەبدولرەقیب یووسف لە کتێبی "تابلۆکانی شەرەفنامە" توێژینەوەیەکی فراوانی لەم بارەوە نووسیوە.

لە ناو تابلۆی دووەمی شەرەفنامە، عوود و ساز دەبینین، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە عوود و ساز ئامێرێکی وا بوونە لە کۆنەوە لە کوردستاندا بەکار هاتووون. یان هیچ نەبێ لە کوردستانی کۆتاییی سالانی ١٥٠٠دا عوود و ساز و مۆسیقا و گۆرانی لە کوردستاندا لە برەودا بوونە.

– مەلای جزیری (١٥٦٧– ١٦٤٠) ناوی ئەم ئامێرە مۆسیقاییانە دەهێنێ لە کوردستاندا: ڕوباب، چەنگ، نای، قانوون، ئەرگەنوون، دەف.

١٦٠٠ – ١٧٠٠

ژیانێکی کولتووریی ڕەونەقدار لە کوردستانی ئێران لە ناوچەی ئەردەڵان

١٦٥٥

لە سەردەمی عەڤداڵخانی میری بەتلیسدا (عەڤداڵخان خۆیشی مۆسیقاژەن و گۆرانیبێژێکی بەتوانا بووە) دۆخی مۆسیقا و گۆرانیی کوردی لەوپەڕی پێشکەوتندا بووە. لەم بارەیەوە، گەڕاڵی عوسمانی، ئەولیا چەلەبی، لە سەفەرنامەکەیدا، بەتایبەتی باسی مۆسیقای کوردی و گۆرانیبێژەکانی شاری مەلاتیە و دیاربەکر دەکا.

– گەڕاڵی عوسمانی، ئەولیا چەلەبی، لە سەفەرنامەکەیدا، ئاماژە بەمە دەدا کە کورد لە کوردستانی تورکیادا بایەخیان زۆر داوەتە گۆرانی؛ چەند تێکستێکی گۆرانیی بۆمان تۆمار کردووە. یەکێک لە تێکستەکان، بریتییە لە گۆرانییەکی فۆلکلۆریی ناوچەی زاخۆ کە لەبارەی رووباری خاپوورەوە بە مەقامی شوورەگر دەیڵێن. گۆرانییەکەش ئەمەیە:

کوردێ چوومە جەزیری کەلەک بەردانێ
چوومە خاپووری خێوەت وەددانێ
ئا یا یا یا ئوو یوو یوو، ئوویێوو یێوو یوو
ئامان مروەت، عەزیزم، بۆچی کەلەندوو.

١٦٩٠

– ئەحمەدی خانی (١٦٥٠– ١٧٠٧) ناوی ئەم ئامێرە مۆسیقاییانە دەهێنێ کە لە کوردستاندا بەکار هاتوون: سەنتوور، جەڕەس، میزڕاب، زوڕنا، نەفیر، تەپڵ، کەمانچە، عوود، تەمبوور، ڕوباب، چەنگ، نای، قانوون، ئەرگەنوون، دەف. هەروەها ئەحمەدی خانی ناوی هەموو ئەم مەقامات و ئاوازانەیشی

هێناوە کە لە کوردستاندا برەویان هەبووە: عوششاق، نەوا، ئووج، کوردان، ڕەهاوی، گووشت، شەهناز، حەزین، ئاهەنگ، تەرەنوم، سەروسەهی، سەبا، نەوبەهاری، دڵگوشا، نەغمە، نسفیە، هوزار، ئەوازە، گوڵڕوح، دڵڕوبا..

١٧٠٠

– گۆرانیی (سیاچەمانە) لە شێوە و کلێشەی هیجایی، دوو میسراعی، لە مەڵبەندی هەورامان، پاشماوەی سترانە زەردەشتییەکانە. ناوەرۆکێکی دینی و عیرفانیی هەیە. نووسەری ناوداری عەرەب، شمس قیس رازی لە (کتاب المعجم فی معاییر اشعار العجم) باسی لێ دەکا.
– خانای قوبادی (١٧٠٠– ١٧٩٥) لە شیرین و خوسرەوەکەیاندا ناوی (٣٠) لە ئاوازە کوردییەکانی بردووە.

١٧١٣

شێخ ئەمیر، لای ئەهلی هەقەکان، بەرجەستەی فریشتەی جبرائیل بووە، مۆسیقاژەن و سروودخوێن و ئاوازدانێکی مەزنی ئەهلی هەقەکان بووە. گڵکۆکەی لە ئاواییی قەزوینە، ١٨ کیلۆمەتری ڕۆژئاوای کنگاوەر. جۆرێک لە مۆسیقای ئەهلی هەق بە ناوی (دەستگای شێخ ئەمیری) بە ناوی ئەم کەلامخوێن و سترانبێژەوە ناو نراوە کە بریتییە لە دوازدە ئاواز. مەقامێکیش بەناوی (مەقامی شێخ ئەمیری)یەوە هەیە. تەنیا پەنجا و دوو بەیت شیعر لە گۆرانییەکانی بە دیالێکتی گۆران پارێزراون و لەلایەن محەمەد موکرییەوە بڵاو کراونەتەوە.

١٧٧٩– ١٨٢٧: مەولانا خالیدی نەفشبەندی.

١٨٢٠/٤/١

گەڕاڵی ئینگلیز، مستەر ڕیچ دەگاتە کوردستان: باس و خواسەکانی گۆرانی و مۆسیقای کوردی و مۆسیقای یەزیدییەکان، دوو نیگاریش لەم بارەیەوە.

ڕیچ دەڵێ: «پاشاکانی بابان هەفتەی جارێک یان دوو جار کۆ دەبوونەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ پیاوماقووڵەکان گوێ لە گۆرانی و موزیک بگرن»، «ئەو کاتە دەهۆڵ، زوڕنا، دووزەلە، شمشاڵ، تەپڵ، بلوێر، دەف.. هەبوو».

مستەر ڕیچ لە ٢٣ی ئاداری (١٨٢٠) لای هۆزی (سوورەمەنی) لای بابانەکان گوێی لە کەمانچە و ڕووباب و گۆرانیی کوردی ڕاگرتووە. پاشانیش چیرۆکی شیرین و فەرهادیان بە گۆرانی بۆ گوتووە، بەکوردی.

مستەر ڕیچ لە گەشتەکەیدا (١٨٢٠) دەڵێ:

«دیسان ئاوازی چۆپی لێی دا و نزیکەی (٣٠) کچ بەڕێز و دەست لە ناو دەستی یەکتر، بەهەنگاوی ناسک و بەشێنەیی چوونە پێش، بێ هیچ پەچە و ڕووپووشێک، لە ناو جلوبەرگی ئارمووش و ڕەنگیندا دەدرەوشانەوە. بەڕاستی ئەمە دیمەنێکی جوان و دیاردەیەکی نوێ بوو بۆ من کە هەرگیز لە ڕۆژهەڵات ئافرەتم نەبینیبوو لەگەڵ پیاوان تێکەڵ بن و خۆیان دانەپۆشن...».

١٧٩٣- ١٨٧١

ڕەحمەتوڵڵا سوڵتان، ناسراو بە (شەڵتاغ)، کوردی کفری، یەکێک لە مەقامبێژ و مۆسیقاژەنەکانی کوردستانی عێراق لە کەرکووک و بەغدا، مەقامی تفلیسی داهێناوە. شێخ جەلال حەنەفی لە (المغنیون البغدادیون) باسی دەکا.

١٨٢٠/١٢/٢٨

مستەر ڕیچ بەهەمان شێوە گەواهی دەدا کە گۆرانی و مۆسیقا لای یەزیدییەکانیش لە مەڵبەندی (شەنگار) هەبووە. هەر لەو ڕۆژەدا وێنەی مۆسیقاژەنێکی نابینای یەزیدیی کێشاوە بەناوی (لاسۆ) کە بە زمانی کوردی گۆرانیی (لێ لێ غەزالێ)ی بۆ گوتووە.

١٨٢١

دیپلۆماتی فەرەنسی، پییێر ئامێدی ژووبێرت (١٧٧٩- ١٨٤٦) لە

سەفەرنامەکەی خۆیدا کە لە ١٨٢١ لە پاریس بڵاوی کردووەتەوە، لەبارەی گۆرانی و مۆسیقای کوردیەوە دەڵێ:

«کورد زۆر حەزیان لە داستانە. گۆرانییەکانی کوردان پڕن لە بابەتی خۆشەویستی و غەزەلی ڕووت و جەنگ و ڕووداوە گرنگ و تراژیدییەکان. مۆسیقای کوردی سادەیە بەڵام هونەرێکی تێدایە، دەربڕینگەرا و غەمگین. گۆیندە زوو زوو ئیقاعەکان دەگۆڕێ، لە هەمان کاتدا نەغمە سەرەکییەکان درێژ دەکاتەوە، هەندێ جار دووبارەشیان دەکاتەوە. سترانبێژ لەگەڵ درێژکردنەوەی ئەو نەغمە سەرەکییانەدا ناڵە و هاوارێکی ئەوتۆ گوزارشت دەکا کە فرمێسک دەخەنە چاوی گۆیندەکەوە و بە دەنگێکی خەفەتناک کۆتایی پێ دێنێ.

کورد کاتێ پەسنی گۆرانیبێژێکی باش دەکەن دەڵێن: «دەنگی ڕۆژە ڕێیەک – فرسەخێک دەڕوا».

١٨٣٠

– مەلا ئەبوبەکرەفەندی (١٧٧٨– ١٨٥٥) باپیری مەلا فەندی (مەلای گچکە)، بایەخی داوەتە مەولوود و مەقامات. لە ١٨٣٠ دەنێرن مەلا عەبدوڕەحمان وەلی لە کەرکووکەوە بێتە هەولێر بۆ مەولوود و مەقامات.

– مستەفا بەگی کوردی (١٨٠٩– ١٨٤٩) باسی چەندان گۆرانیبێژی سەردەمی خۆی دەکا کە بەکوردی گۆرانییان گوتووە.



– له ناوچەی بابانەکان له سلێمانی، دوازده سوارەی مەریوان له کاتی شەڕدا تەپڵ و ئامێره مۆسیقایەکانیان بەکار دەهێنا.

١٨٣٥ – ١٨٩٥

مەڕبێنی قەشە، یەکێک له مەقامبێژ و مۆسیقاژەنه ناوداره‌کانی کۆیه.

١٨٤٩: ڕۆژهەڵاتناسێکی ئەڵمانی باسی بایەخی مۆسیقا و جۆرەکانی مۆسیقا و گۆرانی دەکا له کوردستاندا.

Von Bodenstedt Friedrich Martin: Lieder aus Kurdistan, in T. T. Berlin: 1849

باسێکی زانستییه لەبارەی مۆسیقا و گۆرانیی کوردی.

١٨٥٤: میرزا محەمەد فرسه الدولەی شیرازی له کتێبی (بحور الالحان) به زمانی فارسی باسی ئاوازه کوردییەکانی کردووه.

١٨٤٩: کاتێ نەجیب پاشای والیی بەغدا بەبۆنەی دامرکاندنەوەی شۆڕشی ڕەسووڵ پاشای برای پاشای گەورەی ڕواندز دێته دیوەخانی مەلا ئەبوبەکرەفەندی، ئاهەنگێک ساز دەکەن و مەولوودێک دەکەن و بانگی ڕەحەتوڵڵای شەڵتاغی کورد ١٧٩٧– ١٨٧١ دەکەن؛ مزگەوتی قەڵاتیش نوێ دەکەنەوە. ئەو کاته لیره و مەجیدی پاره بووه. حافزی ئەربیللی، که بەکوردیش گۆرانیی گوتووه، لەوێدا به شیعری تورکمانی باسی ئەم زیارەتەی کردووه.

١٨٦٠– ١٨٦٦

– مەلا مەحمموودی بایەزیدی و ئەلکزەندەر ژابای قونسوڵی ڕووسیا له ئەرزەڕۆم، چەند تێکستێکی گۆرانی تۆمار دەکەن و چاپیان دەکەن:

– لاوێژک. کۆمەڵێک گۆرانییه که پیاوان دەیڵێن و زۆربەی بەیتەکانی به لۆلۆ دەلۆ دەست پێ دەکات. سەرەتای ئەم دەسنووسە: ''لۆلۆ دەلۆ برحی ئەستەنبۆلێ...''؛ کۆتاییەکەی: ''من نزانیا شەیتان لەعنەتی لەو بمین کنیایه...''.



(هنا بغداد) مانگی ئەیلول ١٩٥٧

– بیریتـە. کۆمەڵێک گۆرانیی هەمەچەشنەیە کە لە شایی و هەڵپەڕکێدا دەگوترێ. سەرەتای ئەم دەسنووسە: '' عەیشێ من دی بو لبەر..

مەلا مەحموود بایەزیدی (١٨٦٠) لە کتێبی (عادات و ڕسووماتنامەی ئەکرادیە، و: د. شوکریە ڕەسووڵ، ل ٤٣ دەڵێ: «لە شاییی کوردەواریدا گۆرانیی دیلۆکی زۆر دەبێژرێ و پێی دەڵێن «بیرتە»، گەلێک سترانبێژیان هەیە و بە ئاوازی ئەم سترانبێژانە شاییکەرەکان، ژن و پیاو، کچ و کوڕ، دەستی یەکتر دەگرن و هەڵدەپەڕن. لە ناوەڕاستی شاییەکەدا کچ و ئافرەتیش هەڵدەپەڕن و ستران دەڵێن..»،.

١٨٦١: کتێبی (ئەلفا بێ جێ یا کورمانجی و ئەرمەنی) کتێبێکە لە ئەستەمبۆڵ لەلایەن دەستەیەک نووسەری نەناسراوەوە بە ئەلفابێی ئەرمەنی، بە زمانی کوردی (کرمانجی) بڵاو کراوەتەوە و باسێکی کورتی لەبارەی مۆسیقای کوردی تێدایە.

١٨٨٠: ژیانی دوو مەقامزان و گۆرانیبێژی ناودار، زەینەڵ حەمباڵی کوردی (١٨٤٢– ١٩١٨) و زەینەڵ ناڵبەندی کوردی (١٨٤٦– ١٨٩١).

١٨٨٩: مۆسیقاناسی ئەرمەن، کۆمیتاس، تێزێک لەبارەی گۆرانی و مۆسیقای کوردی دەنووسێت و ١٣ گۆرانیی کوردی بە نموونە دەهێنێتەوە و نۆتەیان بۆ دادەنێ.

١٨٩٠– ١٨٩٥: دەفژەن و دەنگخۆش و مەقامزانەکان: عەلی کۆر (١٨٦٥– ١٩٣٨)، وەلی چایچی (١٨٦٤– ١٩٣٦)..

١٨٩٨

ئارشیمادریت کۆمیتاس Comitas: ئاوازە کوردییەکان Melodies Kurdes، ئیتاڵیا، تۆژینەوەیەکە بە زمانی فەرەنسی لەبارەی مۆسیقا و گۆرانیی کوردی، هەروەها ١٣ نۆتەی سێزدە گۆرانیی کوردیشی تێدایە.

## سەرەتای سەدەی بیستەم

١٩٠٠

- سەید مەردان (١٨٧٤- ١٩٥٢) گۆرانیبێژی کوردی کەرکووک.

- زێوەر دەگاتە ئەستەمبۆڵ و چوار ساڵ لە ناو ژیانی ئەدەبیی ئەوێ بەسەر دەبات و دەکەوێتە ژێر کاریگەریەتیی شاعیرە تورکەکان. سروود دادەهێنێ.

- لە سەردەمی عوسمانییەکاندا لە کوردستان، بەپێی سجلاتی کۆن، وانەی " لیسانی فەرەنسەوی و مۆسیقا و رەسم و ئال ئیشلەری و تەربیەی بەدەنی و حوسنی خەت " دەخوێنرا.

١٩٠١ -١٩٠٢

کوردناسی ئەڵمان، ئۆسکارمان: توحفەی موزەفەرییە، کتێبێکە پڕ لە گۆرانیی کوردی، لە بەرلین چاپی دەکا.

١٩٠٣

ولیەم جاکسن وێنەی گەنجێکی شمشاڵژەنی یەزیدیی کێشاوە لە کوردستانی ئێران.

١٩٠٥ -١٩١٠

دەفژەن و دەنگخۆش و مەقامزانە ناودارەکانی هەولێر: دەروێش مچۆڵ (١٨٧٢- ١٩٤٠)، مەلا نادری سەعاتچی (١٨٧٧- ١٩٤٤).

١٩٠٦ -١٩٠٧

ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی، یۆژین یۆبین هاتووەتە مەهاباد لای رەشید مەلیک حاکمی مەهاباد، بانگهێشت کراوە بۆ کۆنسێرتێکی مۆسیقا و گۆرانیی کوردی کە تێیدا سەعید و حەمەدەمین ناوێک گۆرانییان گوتووە. مەقام و گۆرانییەکان لە شیعری نالییەوە وەرگیرا بوون.

١٩١١

خاڵندەفەندی (١٨٥١ سلێمانی- ١٩٢٧) کە لە هەولێر تەجویدی دەگوتەوە. لە ١٩١١ دەگەڕێتەوە سلێمانی. بۆیە مەلا فەندی لە کەرکووک، لە تازیەکەی شێخ ڕەزا چاوی بە سەید مەردان دەکەوێ، داوای لێ دەکا لە جیاتی خاڵندەفەندی بێتە مزگەوتەکەی و دەرس بڵێتەوە. ئیدی شەهابە دەبێتە شاگردی سەید مەردان.

– سەید مەردان لە تەکیەی کەرکووک برادەری شێخ ڕەزا بووە. لە ١٩١٢ دوای مردنی شێخ ڕەزا دێتە هەولێر، دەبێتە مامۆستای شەهابە.

١٩١٢

دەرکەوتنی چالاکی و گۆرانییەکانی کاوێس ئاغا (١٨٨٩- ١٩٣٦) و سێوە (١٨٩١- ١٩٦٣).

١٩١٣/١/٤ یان لە ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩١٣

– عبدالرزاق بەدرخان لە شاری (خوی) لە کوردستانی ئێران (کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کوردستان) یان (کۆمەڵەی جیهاندانی) دادەمەزرێنێ لەگەڵ قوتابخانەیەکی کوردی کە تێیدا ئەلفوبێی ڕووسی و ئەدەبی ڕووسی و زمانی کوردی فێری قوتابییان دەکەن. وانەی مۆسیقا و سروودیشیان هەبووە. سمکۆ ئاغای شکاک هاوکاریی دەکردن. عەبدوڕەزاق بەدرخان خۆیشی پیانۆیەک لە ماڵەکەیاندا هەبووە و کچەکەی خۆی فێری مۆسیقا کردووە.

١٩١٤

لە سەفەربەلک ڕەشبگیر دەگەڕێ. هەموو دووشەمەیەک لە بەردەرگەی سەرای هەولێر لە ناو قەڵا مۆسیقا و مارشی دەوڵەتی عوسمانییان لێ دەدا و ئالایان بەرز دەکردەوە. شەهابەی گۆرانیبێژ (١٨٩١- ١٩٣٩) لەو تیپە بووە. تازە دەستی کردووەتە بانگدان و سەڵا و گۆرانی و مەقامات.

١٩١٥ -١٩١٦

سەید ئەسغەری کوردستانی (١٨٨٢- ١٩٣٧) گۆرانیبێژ، مەقامزان.

- له هەولێر، سەید غەریب بەرزنجی چاپخانەی «سەید غەریب»ی دروست کرد و بووه بارەگای نووسەر و هونەرمەندان؛ قەوانێکی تێدا بوو گۆرانییەکانی مریەم خان و سێوەی لێ دەدا. مەلا عەلی کلاشدروو شەوان هەقایەتی کوردەواریی تێدا دەگێڕایەوه.

١٩١٨

-عەبدورەزاق دەبباغزاده ١٨٨٦- ١٩٥٩، قورئانخوێن و مجەوید و مەقامزان کە دیوانی فزوولیی هەموو لەبەر، شارەزاییی تەواوی له مەقام و کەرەمی تورکی هەبوو.. شیعرەکانی کاکی هیرانی و وەفایی و نالیی بەگۆرانی دەگوتەوه.. لەسەر مەقامی دەشت شیعری شێخ ڕەزای بەگۆرانی دەگوت.

- عوسمانی دەکشێنەوه بەرەو ئەستەمبۆڵ بینایەی سەرا له قەلا دووشەمان مارشی عوسمانیی تێدا لێ دەدرا به تیپی مۆسیقاوه؛ تا ١٩١٨ هەبوو.

١٩١٩

- مەلا فەندی، شەهابە دەنێرێتە کەرکووک فێری ئوسووڵی مەقامات و تەجوید ببێ لای مەلا محەمەدی کۆر (کەرکووک ١٨٧١- ١٩٤١). ئەویش دەینێرێتە مزگەوتی مورادیە له بەغدا و شەش ساڵ لەوێ دەمێنێتەوه.

- بڵاوبوونەوەی شیعرەکانی صافی هیرانی ١٨٧٣- ١٩٤٢.

١٩٢٠- ١٩٣٠

- دەفژەن و دەنگخۆش و مەقامزانە ناودارەکانی ساڵانی بیستی هەولێر: شەهابە (١٨٩١- ١٩٣٩)، حاجی عەبدولای دەفژەن (١٩٠٢- ١٩٦٣)، عەزە قوونفش (عەزیز ئاغا ١٩٠٤- ١٩٥٩)، عوسمان حەیران (١٩٢٢- ١٩٦٧)،

حاجی عەبدوڵای خەیاڵ (١٨٩٦- ١٩٦٩)، سەید محیەدین سەید خەنجەر (١٨٨٠- ١٩٤٢)، مەلا نادری بێستانچی (١٨٨٦- ١٩٦٣)، لەگەڵ فەقێ سمایلی پەڵکانە (١٨٧٨- ١٩٤١)..

بەهاری ١٩٢١

کارەساتی حەسەنە شەل و گۆرانییە ناودارەکەی شەهابە لەبارەیەوە.

حەسەنە شەل بە فیتی عەلی پاشای دۆغرەمەچی دەچێ کاروانی ئینگلیزەکان لە ڕێی مووسڵ ڕووت دەکاتەوە. ئەوانیش دەیگرن و لە بەردەم سەرای هەولێر قەنارەی بۆ هەڵدەواسن:

چەندم گۆت حەسەن هەستە لە خەوێ
لەبەرت دەکەن فەرمان و کەوێ
حاکمی سیاسی سەری تووی دەوێ



ئەسـتـێـرەک هـەڵات لە هـەورەمـانی
مـاینی حـەسـەنی شـینکەی قـەزوانی
سـەرزین خاسـەڕەنگ ڕکـێب ڕۆمـیانی

عـەسکەر ڕاوەسـتـان لەسـەر مـەیدانێ
حـەسـەنیـان ڕاکـێـشـا لە دیوەخـانێ
بـەسـەرکـۆتی لۆ حـەپسـخـانێ

چەندم گۆت حەسەن هـەستە لـە خەوێ
لـەبەرت دەکـەن فـەرمـان و کـەوێ
حـاکمی سـیاسی سـەری تووی دەوێ

چەندم گۆت حـەسـەن وا نییە وا مـەکە
لە ڕێی ڕەشکینی پۆستەی ڕووت مەکە
(خـانێ) منداڵە بێ بابی مـەکـە

١٩٢٣

– شـۆرەتی سـتـرانبێژ و لاوکـبێـژی کوردی تورکیا، عـەبدال زەینەکی، کـە یەشـار کەمال زۆر پێی کاریگەر و سـەرسـام بووە. یەشار کـەمال لەبارەی ئەم سـترانبێژە ناودارەوە دەڵێ: «مـاڵی ئێمـە بەمەوە بەخـۆی دەنازی کە لاوکبێژ و شـاعـیـری مـیلليـی هەرە گـەورەی کـورد (عـەبدال زەینەکی Abdal Zeyniki) تەشریفی هاوردبووە مـاڵی ئێمە و چەندان جار لە ژێر بنمیـچی ماڵی ئێمـەدا لاوک و داسـتـانەشـیـعری خوێندبووەوە. «ئەمە ئەو مـاڵەیە کە عـەبدال زەینەکی چۆکی تێدا داوەتـەوە و داسـتـانەشـیـعـری تێدا خـوێندووەتەوە». هـەمـیـشـە، بێوچان، گوێمان لەم قسـەیەی خەڵک دەبوو.

یەشـار کـەمـال دەڵێ: «عـەبدال زەینـەکی بۆ من ئەسـحـابەیەک بـوو. تەنانەت لاوکـبـێـژە کـوردەکـانی تریش، ئەوانەی دەهاتنە مـاڵەکـەمـان، بەهرەیان لە

داستانەکانی عەبدال زەینەکی وەرگرتبوو. ژیانی عەبدال زەینەکی بووبووە ئەفسانەیەک بۆ خۆی».

١٩٢٤

یەشار کەمال دەڵێ:

– بۆ یەکەم جار گوێم لێ بووبێ باسی ڕاپەڕینی کوردان کرابێ، دیسان هەر لە ڕێگەی لاوک و گۆرانییە میللییەکان و داستانەکانەوە بوو. من لە باوکمەوە بیستم کە مامی ئەو، واتە میری کورد (گولیخان بەگ) گوێزرابووەوە ئێرە، بە خۆی و بە ماڵ و منداڵەوە لێرە لە تاراوگەدا دەژیا. وەک هەموو سەرۆک عەشیرەتە کوردەکانی تر، بەناچاری ڕێگای تاراوگەی گرتبووە بەر. شایەری عەشیرەتەکەی خۆیشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. تا بەرەبەیان لاوک و داستانی لەبارەی "هەرەس" دەگێڕایەوە، لەبارەی شەڕ و شۆڕەکانی رابردوو؛ ئەو لاوژە و داستانانەی کە قارەمانەکانیان بە گژ عێراقی و ئێرانییەکاندا چووبوون. بە دوور و درێژی بەیتی بەسەر کردەوە بەرزەکانی مامەمدا هەڵدەگوت، بەسەر جەردە بەشەرەفەکان، بەسەر خاڵەکەم کە لە شەڕ کوژرابوو.

کابرای شایەر دەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو، میریش (مامەکەم) نازی بەم خزمەتەوە دەکرد: «شایەری وەکو خۆی لە دنیا نییە»، هەر کەسێک بیویستایە گوێی لێ رابگرێ، وای پێ دەگوت. ناویم لە بیر چووەتەوە. وابزانم هەرگیز بەناوی خۆی بانگیان نەدەکرد، هەر پێیان دەگوت: "دەنگبێژ"، کە بە کوردی دەکاتە "Dengbej".

١٩٢٤

عەلی مەردان، لەگەڵ محەمد محەمد سەعیدی هونەرمەند، هەردووکیان قەوانیان بۆ کۆمپانیای هۆمۆکۆرۆ Homokoro تۆمار کردووە.

١٩٢٥

گۆرانیبێژ، مام هۆمەر، بۆ یەکەم جار لە مێژووی هونەری کوردیدا، لە بەغدا، قەوانی (هەی بەللار).

- یەکەمین تیپی مۆسیقا لە سلێمانی بە سەرپەرشتیی عەبدولواحید نووری و فوئاد ڕەشید بەکر دادەمەزرێ.
- دەرکەوتنی چالاکی و گۆرانی و قەوانەکانی مریەم خان (١٩٠٤- ١٩٤٩)، شەهابە (١٨٩١- ١٩٣٩)، سەبری موهاجیر (١٩٠٨- ١٩٨١).

١٩٢٥: لەیلا بەدرخان (١٩٠٨ئەستەمبوڵ-١٩٨٦پاریس) لە ئەڵمانیا قوتابخانەی بالای هونەری بالیەی ئەڵمانی تەواو دەکات و دەست بەچالاکیی سەر شانۆ دەکا.

## ١٩٢٦

## سەرهەڵدانی تەنزیرات لەبارەی مۆسیقاوە

١٩٢٦

- شێخ نووری شێخ ساڵح (١٨٩٦ــ ١٩٥٨) یەکەمین نووسەری کوردە کە ڕا و تەنزیرات لەبارەی هونەری مۆسیقاوە دەخاتە ڕوو؛ لە ساڵی ١٩٢٦ شێخ نووری شێخ ساڵح، لە سلێمانی، لە ژمارە ٢١ و ٢٤ی رۆژنامەی (ژیان) بە ٢٥ ئەڵقە، هەموو بەشەکانی هونەرە جوانەکان ''سەنایعی نەفیسە'' (نیگارکێشان، مۆسیقا، پەیکەرتاشی، بیناسازی، وێنەگەری) شی دەکاتەوە.

ناوبراو بۆ یەکەمین جار لە وتارێکدا تەنزیرات لەبارەی مۆسیقاوە بڵاو دەکاتەوە و دەیەوێ ئێستاتیکای گۆرانی و مۆسیقا بڵاو بکاتەوە. لەم بارەیەوە بنچینەی داهێنانی مۆسیقایی دەگەڕێنێتەوە بۆ بەهرەی مۆسیقاڕ-خۆی، نەک بۆ سروشت و دنیای دەرەوە: ''ئەوەی لە رۆحی ئێمەدا حەضێکی بەدیعی حاسڵ بکا ئەوەیە کە لە دەستی مەهارەتێک و سەنعاتکارێک دەربچێ؛ یەعنی



بەربانگ
ژمارە ٧٣
گۆڤاری فیدراسیۆنی کۆمەڵە کوردستانییەکانە لە سوید
ساڵی ١٠، ١٩٩٦
LEILA BEDERKHAN
DANSES D'ORIENT

هەموو وەقتێک ئەوەی کە هەیەجانێک بۆ ئێمە حاسڵ ئەکا رەسم و مۆسیقا نییە بەڵکو ئەو سەنعەت و مەهارەتەیە کە قیمەت ئەدا بەمانە''. هەروەها لەبارەی پێوەندیی ئەدەب بە مۆسیقاشەوە دەڵێ: ئەو تەئسیرەی کە لە قصەیەکی جوان بۆمان حاسڵ ئەبێ لەگەڵ چاوپێکەوتنی لەوحەیەک و بینایەکی جوان و گوێ لە مۆسیقاگرتنێکی خۆش عەینی تەئسیرە». نووسەر لەم بەرهەمەیدا هەموو بەشەکانی هونەرە جوانەکان ''صەنایعی نەفیسە'' شی دەکاتەوە و باس لە هونەری مۆسیقا و گۆرانی دەکات.

– لە ساڵی ١٩٢٦ لە ناو سیستەمی پەروەردەی هەولێردا لێژنەیەک بە ناوی (لیجنەی فەن و تەمسیل) هەبووە یان (لیجنەی فنوونی جەمیلە). هەروەها، بەپێی سجلاتی کۆنی پەروەردەی هەولێر، وانەی '' لیسانی فەرەنسەوی و مۆسیقا و رەسم و ئال ئیشلەری و تەربیەی بەدەنی و حوسنی خەت '' دەخوێنرا. کەواتە، دەرسی مۆسیقا و هونەرە جوانەکان بەشێک بوونە لە پێداویستییەکانی خوێندن و پەروەردە لە هەموو شارەکانی تری کوردستانی عێراقدا: قوتابییان فێر کردووە چۆن مۆسیقا لێ بدەن و چێژی ئیستاتیکی لە گۆرانی و هونەرەکان وەربگرن. لەوەش دەچێ لەو کاتەدا پێشانگە و میهرەجانی هونەریی قوتابییان کرابێتنەوە. میهرەجانە هونەرییەکانی سلێمانی لە ساڵانی ١٩١٠ و ١٩١٢ بەولاوە پەیدا بوونە. لە هەولێریشدا لە ساڵانی ١٩٢٠ بەملاوە.

وردە وردە دەیان قوتابخانەی تر لە کوردستاندا سەریان هەڵدا و لە کۆتاییدا قوتابخانە بۆ کچانیش دەرگاکانیان کەوتە سەر پشت. چالاکییەکانی ئەم قوتابخانە و کۆمەڵە و رێکخراوانە، رۆڵێکی دیاریان هەبوو بەسەر بووژاندنەوەی رۆشنبیری و نەشونمای جموجۆڵی هونەری. قوتابخانەکان، بەتایبەتی چالاکییە هونەری و کولتوورییەکانیان، رۆڵیان هەبووە لە بڵاوکردنەوەی چەمکە کولتوورییە تازەکان و نوێکردنەوەی چێژی ئیستاتیکیی خەڵک. لە رۆژنامەی ژیان، لە ژمارە ١٩، لە ٥ی ئابی ١٩٢٩دا نووسراوە:

وەزارەتی مەعاریف ئەم ساڵ بیست طەلەبە ئەنێرێ بۆ دارلفنونەکانی

ئینگلتـەرە، ئەمـەریکا، بـەیرووت، مـیسـر. ئـەمـانـە لە فـەنی تەربیـە و تەعلیم، هەندەسە، ئەلکتریک و زراعەتدا تەحسیلّ ئەکەن.

ناردنی قـوتابییـانـی کورد بۆ دەرەوەی ولاّت بۆ خـوێندن، بێگومـان، زەمـینە خۆش دەکات کە لە داهاتوودا رۆڵەکانی کورد سوود لە هونەرە جوانەکانی ئەو ولاّتانە وەربگرن و لە ولاّتی خۆیاندا بەرهەمیان بێننەوە.

١٩٢٦

حەمدی ئەفەندی (١٨٨٧– ١٩٤٩) لە بەغدا چەند قەوانێکی گۆرانیی کوردی تۆمـار دەکا لەوانە: ئای ئای، پیرەمـەگروون مـوقـەددەسـی – کە شـیعـری زێوەر بووە و بە پیـانـۆ گـوتـراوە». ئەمـەش لە رێگەی عـومـەر قـەزاز، یەکـەم وەکـیلی کۆمپانیای قەوانی گرامافۆن لە سلێمانی کە داوای لە کۆمپانیای ئەیو چەلب Hismasters - voice کردبوو بۆ ئەم مەبەستە.

– عـەبدولواحیـد ئاغای مـسـتەفـا کۆیی کـە لە باندۆی مـەلیکدا موعـەلیم بوو، دوای کڕینی دامـودەزگای مـۆسـیقـایی و پیـانـۆ بۆ قـوتابخـانـەیەکی سـەرەتاییی کوڕانی سلێمـانـی، بەخـۆڕایی وانـەی مـۆسـیقـا و گۆرانیی بە قـوتابییـەکان گوتووەتەوە و فێری مۆسیقای کردوون.

مانگی ئەیلوولی ١٩٢٧

– بەختیار زێوەر شیعری گۆرانیی (تانجەڕۆ) هەوڵدانێکە بۆ شیعری ئازاد.

١٩٢٨– ١٩٢٩

– لاوکبێژی کورد لە کوردستـانی تورکیـا، عەبدال مووسا، کە یەشـار کەمالی رۆمـاننووس بە لاوکبێژ و سـترانبـێـژێکی باش لە قـەڵەمی دەدا. یەشـار کەمـال دەڵێ: «ئێمە لە مـاڵەوە گۆرانییە فۆلکلۆرییەکانمان دەگوتەوە، ئەو گۆرانییانەی پێیان دەگـوترێ «تورکوو Turku». مامەکـەم دەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو، بەلاّم هەمـیـشـە هـەمـان نـەزمـی دەگـوتـەوە، تـەنیـا چـەند شـیـعـرێکی تازەی دەخـسـتنە سـەر».

ئەم گۆرانییە کوردییانە، سەرتاپای منداڵانی گوند دەهاتن گوێیان لێ ڕادەگرت؛ دەهاتن لە ژێر پەنجەرەی ماڵەکەمان یان لەودیو پەردە حەسیرییەکانەوە کۆدەبوونەوە. من، پاشان، دەچووم قسەکانی (شیعرەکان)ی ئەو گۆرانییە کوردییانەم دەکردنە تورکی. وای لێ هات ماوەیەک هیچم نەما وەری بگێڕم: هەرکە دەستم بە گۆرانییەکە دەکرد، منداڵ لە ژێر پەنجەرەکەدا کۆدەبوونەوە، ئیدی چونکە هەموو شیعرەکانیان ئەزبەر کردبوو، هەموو لا پێکەوە گۆرانییەکەمان بە یەک دەنگ دەگوتەوە. گۆرانییەکە باسی گۆلی (وان)ی دەکرد، سۆزێکی غەریبیی قووڵی بۆ گۆلی (وان) دەردەبڕی. ئەم مەڵبەندە بەهەشتێک بوو لەسەر زەمین».

یەشار کەمال دەڵێ:

«تەمەنم هەشت ساڵان بوو، لاوکبێژی کورد، عەبدال مووسا، جارێکیان داستانێکی بە کوردی لەبارەی چقوورئاوا بۆ گێڕامەوە، کە دەچووەوە سەر داستانەکانی داستانبێژی کورد عەبدال زەینەکی. ناواخنی ئەو داستانە بە شان و باڵی (محەمەد پاشای سوورەملی)، فەرمانڕەوای گەورەی کوردی هەڵدەدا، کە کاتی خۆی بەخۆی و سوارچاکەکانییەوە رژابوونە ئەو دەشتە بۆ ئەوەی شەڕ لەگەڵ فەرمانڕەوای تورکمانەکانی قۆزان ئۆغڵوو Kozanoglu بکات».

١٩٣٠- ١٩٤٠

- لەیلا بەدرخان (١٩٠٨- ١٩٨٦) لە ساڵانی کۆتایی سییەکان و چلەکاندا ئەستێرەیەکی گەشاوەی گۆرانی و مۆسیقا و سەمای کوردییە لە ئەوروپا. ژمارە (٣)ی کۆواری نزار، ساڵی ١٩٤٨ باسی کردووە؛ جگە لە دەیان کۆواری مۆسیقایی بە فەرەنسی، لەو کاتەدا.

١٩٣١

- بەستنی کۆنگرەی مۆسیقای وڵاتانی عەرەب لە قاهیرە کە عەلی مەردان بەشداریی تێدا کرد.

– عەلی مەردان و محەمەد گوبانچی دێنە هەولێر گوێیان لە شەهابە دەبێ.

– دەروێش ڕەمەزان سلێمان، دەنگخۆش و مەقامزان و مەولوودخوێنی ناوداری هەولێر.

– ١٩٣١/٦/٦: مەلیک فەیسەڵ بۆ جاری دووەم دێتە هەولێر، لە یانەی هەولێر ئاهەنگی بۆ دەکەن. مەلیک و موتەسەڕیف و مەلای گەورەی کۆیە و مەلا فەندی لە ڕیزی پێشەوە دادەنیشن. سەید مەردان قورئان دەخوێنێ، پاشان سروودی قوتابییان، ئنجا شەهابە دەست بە مەقامات دەکا.

١٩٣٢

– لە هەولێر (لیجنەی فەن و تەمسیل) بووە (لیجنەی فنوونی جەمیلە). ئەم لێژنەیە لە کۆتاییی بیستەکاندا و سەرەتای سییەکاندا گەشەی سەند.

– مێژوونووس و مۆسیقاناسی فەرەنسی، گی. میکائیلیان G. Michalian لە وتارێکدا A propos de la musique Kurde لە گۆواری (هاوار)، ژمارە (١٠)، ل ٧، لە ساڵی ١٩٣٢ لە دیمەشق، باس لە مێژووی مۆسیقای کوردی دەکا.

١٩٣٢/١١/٢٨

– ئوم کەلسووم لەسەر داوای وەزارەتی ئیرشادی عێراقی لە بەغدا ئاهەنگی ساز دا. وەزارەتی ئیرشاد شەهابە بانگهێشت دەکا بۆ ئەوەی لەگەڵ ئوم کەلسووم گۆرانی بڵێ لە گازینۆی هیلال لە بەغدا.

– عەلی مەردان و شەهابە و محەمەد گوباچی (ئوم کەلسووم داوا لە شەهابە دەکا) دەبێ بچنە کۆنگرەی مۆسیقایی لە قاهیرە. هەموویان دەچن کەچی شەهابە بۆی مەیسەر نابێ لەگەڵیان بڕوا.

– شێخ نووری شێخ ساڵح نازناوی «ئوسووڵ شناس» دەداتە (شەهابە)ی گۆرانیبێژی هەولێری.

– حەیدەرە کەچەڵ (١٩٠٤– ١٩٧٩) لە سییەکان تا شەستەکانیش گۆرانیبێژێکی ناوداری هەولێر بووە.



گۆڤاری (هنا بغداد) مارت ١٩٥٥

– کوردی و مەریوانی کتێبێک بە ناونیشانی (گۆرانی و سروودی کوردی) لە چاپخانەی (ایتام) لە شاری بەغدا بە زمانی کوردی بڵاو دەکەنەوە کە (٦٥) سروود و گۆرانیی کوردیی تێدایە.

نەورۆزی ۱۹۳۳

– لە بەغدا لای (راس جسر القدیم) گازینۆیەک بە ناوی (مومەییەز) هەبوو. ئەو چایخانەیە تیپێکی مۆسیقای لێ بوو لە چوار پێنج کەس پێکهاتبوو کە پێی دەگوترا (تەخت) یان (چاڵغی). هەموو ئامێرژەنەکان، بە سەروسەکوت و ناویانەوە دیاربوو جوو بوون: نەسیم بەسسوون کەمانچەی لێ دەدا. شاول بەسسوون سەنتووری لێ دەدا. حسقێل شاوول دەف زنجاری لێ دەدا. ئەحمەد زیدان ناوێک مەقامی دەخوێند.

شەهابە، پاشان حەیدەرە کەچەڵ و مشکۆ دەچوونە ئەو گازینۆیە.

– حوسێن موکریانی عزەدین فەیزی و ڕۆشنبیرانی هەولێر لە ماڵی سەلیم سەیدۆک یەکەمین نەورۆزیان بەنهێنی گێڕا.

– دەرکەوتنی یەکەم گۆرانییەکانی حاجی جەمیل قاپقاپچی (۱۹۰٥– ۱۹۹٦)، عەزە قوونفش (عەزیز ئاغا ۱۹۰٤– ۱۹٥۹) لە هەولێر.

۱۹۳۳– ۱۹۳٤

لەیلا بەدرخان (۱۹۰۸ئەستەمبۆڵ– ۱۹۸٦ پاریس) لە ئیتاڵیا لە بەڕێوەبەرایەتیی دەزگای (La scala de Milan) ئەندام بووە، لە فیستیڤاڵێکی هونەریی جیهانیدا، لە ڤیستیڤاڵێکی سالزبۆرگ Salz boug (پێش ۲۰/٥/۱۹۳٥) بەشدارییەکی چالاکانە و کارامەی کردووە، شەرەفی ئەوەی دراوەتێ کە لە بالیەیەکی بەناوبانگی رۆژهەلاتییانەدا رۆڵی بنچینەیی ببینێت: لە بالیەی (Respighi) بەناونیشانی (بەلقیس شاژنی سەبا -Balkis Reine de saba).

١٩٣٥/٥/٢٠

لەیلا بەدرخان ئاهەنگێکی فراوانی سەما و مۆسیقای کوردیی ساز داوە. ئەم ئاهەنگەی لە شاری پاریس، لە هۆڵی (مارسێلان بێر تێلوت Centre Mar-celin BertheLot) ساز کردووە. زیاتر لە پێنج دیمەنە سەمای پێشکێش بە جەماوەر کردووە، تیپێکی ئۆرکستراتی فراوانی لە ژێر سەرپەرشتیی مۆسیقاژەنێک بەناوی (مۆریس ناگژیار– Naggiar Maurice) هاوکاریی کردووە لە پیادەکردنی مۆسیقا و هاونەغمەکردنی سەماکانیدا.

ئەم ئاهەنگە سەربژاردەیەکی فراوان لە رووناکبیر و هونەرمەندانی گەورەی فەرەنسی بینیویانە، هەروەها چەند شەخسیەتێکی ناوداری عەرەبیش بۆ بینینی ئەم ئاهەنگە هاتوون. دوا بەدوای ئاهەنگەکەش، حەوت رۆژنامە و کۆواری جیاجیای پاریسی، وتار و ڕاپۆرتیان بەوێنەی جۆراوجۆرەوە لەبارەی ئەم ئاهەنگە بڵاو کردووەتەوە.

دووشەم ١٩٣٥/٦/٢٤

لەیلا بەدرخان لە پاریس: ئاهەنگێکی مۆسیقا و سەمای کوردی لە کاتژمێر (٩)ی ئێوارە ساز دەدا. ئەم ئاهەنگە، پێش ساز کران، پروپاگەندەیەکی رەسمیی فراوانی بۆ کراوە، ئەفیشی گەورە و جۆراوجۆری بۆ ساز کراوە و لەگەڵ وێنەیەکی هونەرمەندی کورد بە شاری پاریسدا بڵاو کراوەتەوە. لە ئەفیشەکەدا بە فەرەنسی نووسراوە (لەیلا بەدرخان، کچە سەماکەری کورد لە سەما رۆژهەڵاتییە فۆلکلۆری و هاوچەرخەکانیدا). ئۆرکستراکە لە ژێر بەڕێوەبردنی خۆیدا بووە، مۆسیقاژەن: مۆریسی ناگژیار (Naggiar Maurice)، پیانۆژەن ئێرین ئایە تۆفا Iren Aitoff.

ئەم ئاهەنگە لە هۆڵێکی گەورە و بەناوبانگی شاری پاریسیدا بەناوی (رامز) / Grande salle rameau ساز کراوە. بلیتی ئەم ئاهەنگە: (٣٠) و (٢٥) و (٢٠) و (١٥) و (١٠) فرەنک بوو، لە چوار مەڵبەندی هونەری و مۆسیقاییی شاری پاریسدا فرۆشراوە، وێنەی سەر ئەفیشەکە بە کامێرای ستۆدیۆی (Iris) گیراوە.

هەروەها لە هەمان ساڵدا ئاهەنگێکی فراوانی مۆسیقای رۆژهەڵاتیی تری ساز داوە. ئەفیشی ئەم ئاهەنگە، لە ئەفیشی ئاهەنگەکەی پێشوو زۆر گەورەترە. بەفەرەنسی لەسەری نووسراوە (میهرەجانی سەما رۆژهەڵاتییەکان. لەلایەن لەیلا بەدرخانەوە).

پرۆگرامی ئاهەنگەکە دوو بەش بووە، کە بە هەمووی لە یازدە دیمەنە سەمای جۆراوجۆر پێکهاتووە: خۆڕازاندنەوەی رەزا (میناتۆری فارس)، خالکوبیی فارس، دیلان (سەمای کوردی)، نیگای هیندی، هیرۆگلیف، سەمای درووزی، مار، گۆرانیی بووکگواستنەوە، ئاوازی دینداری، بەلقیسی شاژنی سەبا، بالاد، ئۆرکسترای ئەم ئاهەنگەش هەر لە ژێر بەڕێوەبردنی خۆیدا بووە.

١٩٣٥/٦/١

ڕەخنەگری مۆسیقاییی فەرەنسا Geroges Mussy لە کۆواری لۆ فیگارۆی پاریسی Le Figaro بە زمانی فەرەنسی لەبارەی لەیلا بەدرخانەوە دەنووسێ:

لە پاریس لە بەلجیکا، لە هۆڵەندا، لە ئیسپانیا، لە سویسرا، لە ئەمەریکا ...تاد وەرزی رابردوو، لە ڤیستیڤاڵی ساڵزبوورک پێمان کرا بە دیمانەی لەیلا بەدرخان شاد ببین، هەروەها بەم دواییەش، خاتوونی ناوبراو لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتیی (سکالا دی میلان – Milan la. Scala) رێک کەوتبوو بۆ ئەوەی رۆڵی بنچینەیی ببینێت لە بالیەی رۆژهەڵاتیانەی Respihi بەناونیشانی (بەلقیس، شاژنی سەبا BALKIS REINE DE SABA).

ئێمە باسی هەموو سیحر و دڵڕفێنییەکمان کرد کە لە پێکهاتنی هونەریی ئەم کچە هونەرمەندە چەکەرە دەکات، ئەو کچە هونەرمەندەی، کە جوانیی تام و بۆی سەماکانی، ئوبهەت و سیحری رۆژهەڵاتی دێرینت لەلا زیندوو دەکاتەوە. لەیلا بەدرخان، کە لە لێهاتوویی‌دا خاوەن دەستاوەردێکی یەکجار فراوانە، بەهرەی خۆی لە چەند سەرچاوەیەکی جۆراوجۆرەوە هەڵێنجاندووە.. کەلەپووری میسری، میناتۆری فارسی سەمای دینداری Rituelle یاسەما فۆلکلۆرییە رۆژهەڵاتییەکان.

ئەو کچە لە لێهاتوویی خۆی، شەخسیەتێکی ئەفسانەییت لە بەرچاو زیندوو دەکاتەوە، وێڕای شکۆمەندییەکی پڕ لە ویقار کە ئەمە لەلای ئەودا، دەتوانێ بڵێی کە شتێکی زگماکە.

١٩٣٥

– کۆمپانیای (بەیزەفۆن) و (ئۆدیۆن) بۆ تۆمارکردنی قەوان دێتە هەولێر، داوای لە عەلی مەردان کردبوو کە گۆرانی بۆ گۆرانیبێژەکان لەسەر قەوان تۆمار بکات. عەلی مەردان لەگەڵ محەمەد گوبانچی هاتنە هەولێر و لای مەلا فەندی میوان بوون، داوایان لە شەهابە و سەید مەردان و حاجی وەلی و عەلی کوێر و مەلا نادری سەعاتچی و دەروێش ڕەمەزانی سولەیمان و حاجی عەبدوڵای دەفژەن کرد کە بچنە بەغدا گۆرانییان بۆ تۆمار بکات. هەندێکیان بەڕای خۆیان، هەندێکی تریش لە ژێر کاریگەریەتیی مەلافەندی و مەلاکانی تر.. بەلایانەوە شوورەیی بوو ببن بە «چاوەش و موترێب».

– گۆرانیبێژی جوولەکەی بەغدایی، عەفیفە ئەسکەندەر، هاتووەتە هەولێر ئاهەنگی کردووە.

١٩٣٦

– لە ١٩٣٦/٧/١ ڕادیۆی بەغدا لە شاری بەغدا دادەمەزرێت و بۆ یەکەم جار بێژەرێک، عەبدولستار فەوزی، مامۆستای زمانی ئینگلیزی بوو، گوتی (هنا محطة الاذاعة اللاسلكية للحكومة العراقية في بغداد).

– ئەمینی عەڤداڵ (١٩٠٦– ١٩٦٤) و حاجیێ جندی لە (٦٦٣) لاپەڕەدا گۆرانییە فۆلکلۆرییە کوردییەکان تۆمار دەکەن.

– قوتابخانەی ئەیووبییە لە هەولێر دروست دەکرێت: چالاکیی هونەریی قوتابخانەکان لە هەولێر زیاد دەکا.

١٩٣٧

– لە ناوەڕاستی سییەکاندا شەهابەی گۆرانیبێژ (١٨٩١– ١٩٣٩)، زوو زوو



حەرەمی سوڵتان و میرەکان پڕ بووە لە جاریە و
کەنیزەک و سەما و مۆسیقا

دەچووە کەرکووک لە تەکیەی تاڵەبانی مێوان دەبوو، لەگەڵ محەمەد چل بۆین، حەمەدەمین کۆترمل، دایی ئەمینی باغەوان و عەلی مەردان.. مەقامیان دەگوت. شەوانی دووشەم و هەینیش زیکر و تەهلیلە لە تەکیەی شێخ محیەدینی هەولێر دەکرا، شەهابە لەوێ دەبوو.

١٩٣٨-١٩٣٧

– ئیسحاق ماردینی جوولەکەی کوردی تورکیا، هەموو ساڵێک لە کاتی کەپرەشینەی جوولەکاندا بۆ ماوەی (١٠) ڕۆژ لە گەڕەکی تەعجیل ئاهەنگی دەگێڕا لەگەڵ شەهابە.

– شەهابە لە کۆیە لە دیوەخانی مەلا ئەسعەد و مەلا ئەحمەدی کۆر و حەنێلە خڕە و ئەمینی سەمەن.. لەوێش دەعوەت کراوە و گۆرانیی گوتووە.

١٩٣٩

– لە ١٩/تشرینی دووەمی ١٩٣٩ لە بەغدا بەشی کوردی لە ڕادیۆی بەغدا دادەمەزرێت کە لە سەرەتادا تەنیا بۆ ماوەی (١٥) دەقیقە بوو، تێیدا هەواڵ و یەک دوو قەوانی کوردی پێشکێش دەکران. هەواڵی جەنگی جیهانیی دووەم و هەواڵی سیاسی دەخوێندرایەوە. بێژەرە کوردەکە ناوی (کامیل کاکەمین) بەئەسڵ خەڵکی سلێمانی بوو، کە پاشان کرایە بەڕێوەبەری ئێزگە کوردییەکە. هێندەی پێ نەچوو عەلی مەردان یەکەم قەوان و گۆرانی و مەقامەکانی خۆی لەو ئێزگەیەدا تۆمار کرد.

– حەیدەرە کەچەڵ (١٩٠٤- ١٩٧٩) بە مەلا وەلی سەرسام بوو. لە سییەکان بازاڕی قەوانی تورکیی (جەلال بەگ)ی دەنگخۆش و حەیدەرە کەچەڵ گەرم بوو. شەوان لە دەشتان گۆرانیی دەگوت و خەڵک گوێیان لێ دەبوو.

– مشکۆ، شەوکەت سەعید (١٩٠٨ – ١٩٨٩/٥/١٩) شۆرەت پەیدا دەکا.

– لە ١٩٣٩: کرانەوەی پەیمانگەی هونەرە جوانەکان لە بەغدا.

١٩٤٠

زەمانی جەنگی دووەمی جیهانی، ئامێری ڕادیۆ لە کوردستانی عێراق پەیدا بوو. لە ٩ی شەو دەیگوت: هنا لندن هیئة الاذاعة البریطانیة. ئنجا هەواڵەکانی شەڕی نێوان هاوپەیمان دژی "دول المحور"، ئنجا عەبدولوەهاب و گوبانچی و ئەسمەهان و ئوم کەلسوم. هەندێکیش (بەرلین)یان دەکردەوە دەیگوت: «هنا برلین»، منداڵ دەیانگوت: (لا اله الا الله/ ئینگلیز بشکێ ئینشاڵا). کاتێ ڕادیۆ تازە پەیدا بووبوو پاترییەکەی لە خۆی گەورەتر، یوونس بەحری، بێژەر بوو.

– سەیرانێکی نهێنیی نەورۆز لە قەتەوی کراوە.

١٩٤١/٣/٥

– حکوومەتی فەرەنسا لە بەیرووت ئێزگەیەکی ڕادیۆی بە زمانی کوردی لە بەیرووت دامەزراند بۆ ئەوەی سۆزی کورد بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، واتە لە پێناو پڕوپاگاندەکردن دژی هیتلەر. ڕادیۆکەش بەشێک بوو لە ڕادیۆی لبنان.

– بە هەمان شێوە ئینگلیزەکانیش لە ١٩٤١ لە ڕادیۆی (محطة الشرق الادنی للاذاعة العربیة) بۆ ماوەی دوو کاتژمێر دەنگوباس و وتار و گۆرانی و مۆسیقای بە زمانی کوردی پەخش دەکرد.

١٩٤٣

– دەنگخۆش و مەقامزانە ناودارەکانی هەولێر: مەلاساڵحی دەفژەن (١٨٩٨– ١٩٧٤)، نەسیم بازرگان (١٨٨٢– ١٩٧٠«؟»)، سۆفی حەمک (١٨٩٥– ١٩٦٥)، پاپخە کۆر (١٨٩٨– ١٩٦٧)، زەکی بارۆخ..

– مشکۆ لەگەڵ حەیدەرە کەچەڵ لە ناوەڕاستی چلەکاندا دەچوونە گازینۆی ئەتڵەسی مووسڵ، لەوێ گۆرانییان دەگوت.. تا نیوەشەو. غانم یەحیای مۆسیقاژەنی مووسڵاوی هەموو جارێک بۆ خۆی ترومبێلی بەدوایاندا دەنارد، هەموو جارێکیش دوای تەواوبوونی ئاهەنگەکان هەر بۆ خۆیشی بە ترومبێلی شوفێرەکانی خۆی دەیناردنەوە هەولێر.

١٩٤٥- ١٩٥٠

- سالم میكائیلی پرهام كه كوردی جوولەكەی سەقز بوو كتێبێک بە زمانی فارسی و كوردی لەبارەی گۆرانییە كوردییەكانی كوردستانی ئێران بڵاو دەكاتەوە: «ترانەهای كوردی».

- دەركەوتنی حەسەن زیرەک، هەروەها (بەدیع قازانجی) لە شاری ئورفە و كوردستانی توركیا.

- شۆرەتی (دەروێش عەبدوڵا) لە سلێمانی كە هونەرە بەرزەكەی، كاری كردووەتە سەر ڕۆحی عەبدوڵا گۆرانی شاعیر و بەراوردی دەكا بە (بیتهۆڤن).

١٩٤٨

- شاكر فەتاح لە ژمارە (٣)ی كۆواری نزار لە بەغدا چەند دێرێک لەبارەی سەماكەری كورد، لەیلا بەدرخان (١٩٠٨ئەستەمبوڵ- ١٩٨٦ پاریس) دەنووسێت.

- سەرەتای ڕەفیق چالاک و ڕەشۆڵ لە شاری سلێمانی، ڕەسووڵ گەردی (١٩٢٢- ١٩٩٤/٤/١٧) لە هەولێر.

## گۆرانی و مۆسیقای کوردی

### لە ئەنادۆڵی کوردستانی تورکیا ساڵانی ١٩٢٠- ١٩٣٠

ئالان بۆسکێ Alain Bosquet شاعیر و رۆماننووسی گەورەی ئەمڕۆی فەرەنسا، دیالۆگێکی دوور و درێژی لەگەڵ یەشار کەمال لە ژێر ناونیشانی (یەشار کەمال، هاوپەیڤین لەگەڵ ئالان بۆسکێ Entretiens)، لە دەزگای Gal-limard لە ساڵی ١٩٩٢ بڵاو کردووەتەوە. لەو کتێبەدا، چەند قسەیەکی یەشار کەمال دەبن بە بەڵگە و گەواهییەکی گرینگ لەبارەی دۆخی گۆرانی و مۆسیقای کوردی لەو ناوچەیەی کە یەشار کەمال منداڵیی خۆی تێدا بەسەر بردووە لە ناوەڕاستی کوردستانی تورکیا.

یەشار کەمال وەک خۆی لەو کتێبەدا دەڵێ، کە لە ساڵی ١٩٢٣ لەدایک بووە، هەروەها ئاماژە بەمەش دەدا کە ئەم ڕووداوانەی دەیانگێڕێتەوە کاتێک بووە کە ئەو تەمەنی هەشت نۆ ساڵان بووە. ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێ کە ساڵ کۆتاییی ساڵانی ١٩٢٠ و سەرەتای ساڵانی ١٩٣٠ بووە.

یەشار کەمال دەڵێ:

- باوک و دایکی من، کاتێ لە ساڵی ١٩١٥ڕووس هاتن شاری (وان)یان داگیر کرد، ئەوان لە ترسان ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵاتیان بەجێ هێشت. ساڵ و نیوێکیان پێ چوو تا توانییان بگەنە چقوورئاوا و لەو گوندە نیشتەجێ بن.

خاڵم «مەیرۆ» بوو، بەناوبانگترین ئەشقیای ئەو مەڵبەندەی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات-ئێران و قەوقاس بوو. خەڵک دەڵێن کە لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا کوژراوە. من بۆ خۆشم، دوای مردنی ئەو، گەلێک بەیت و بالۆرەی ئەوتۆم گوێ لێ بووە کە ئەو -خۆی ڕۆڵی قارەمانی تێدا دەگێڕێ.

کاتێ دەستم کردە شیعر نووسین، تەمەنم هەشت ساڵان بوو. بە شێوازی شاعیرە میللییەکانی ئەو مەڵبەندە شیعرم دەنووسی. ماڵی ئێمە بەمەوە بەخۆی دەنازی کە لاوکبێژ و شاعیری میللیی هەرە گەورەی کورد (عەبدال زەینەکی Abdal Zeyniki) تەشریفی هاوردبووە ماڵی ئێمە و چەندان جار لە ژێر بنمیچی ماڵی ئێمەدا بووە کە لاوک و داستانەشیعری خوێند بووەوە. «ئەمە ئەو ماڵەیە کە عەبدال زەینەکی چۆکی تێدا داوەتەوە و داستانەشیعری تێدا خوێندووەتەوە». هەمیشە، بێ وچان، گوێمان لەم قسەیەی خەڵک دەبوو.

عەبدال زەینەکی بۆ من ئەسحابەیەک بوو. تەنانەت لاوکبێژە کوردەکانی تریش، ئەوانەی دەهاتنە ماڵەکەمان، بەهرەیان لە داستانەکانی عەبدال زەینەکی وەرگرتبوو.



یەشار کەمال

ژیانی عەبدال زەینەکی بووبووە ئەفسانەیەک بۆ خۆی. هەر داستانبێژێک کە بە ماڵەکەماندا تێپەڕ دەبوو، دیمەنێکی نەوباوی تری دەخستە سەر ئەفسانەکە.

هەر لە تەمەنی هەشت ساڵیمەوە، کە پڕ بووم لە سەرسامی لە هەمبەر ئەو داستانبێژانە، دەچووم منداڵانی گوندم کۆ دەکردەوە بۆ ئەوەی داستانیان بۆ بگێڕمەوە. پاشان وردە وردە گوێگرەکانم خەڵکی گەورەشی گرتەوە. من



Née aux bords fabuleux d'un Orient lointain,
Fille de Salomé, sœur de Shéhérazade,
Elle est venue à nous, sultane de parade,
Étoile vagabonde au gré de son Destin.

Vibrant éperdument aux sons des flûtes grêles,
Ou prêtresse figée aux poses hiératiques
Elle dévoile aux plis de ses lâches tuniques
Un corps marmoréen que moula Praxitèle.

Créature de chair ou princesse de rêve?
Elle danse. Un accord éclate et puis s'achève.
Romance du désert ou Phrase rituelle.

Incarnant Baladi et Balkis tour à tour,
Elle évoque à nos yeux la Beauté éternelle,
Au dessus du Désir, au dessus de l'Amour.

Professeur R. Fath
(dans la Gazette de Lausanne)

**Leila BEDERKHAN**
La Danseuse Kurde
Dans ses Danses d'Orient
Populaires et Stylisées

وێنەی ژمارە (٧). ئەفیشێکی دیکەی پڕوپاگاندەی ئاهەنگەکانی کە شاعیرێکی فەڕەنسی، پرۆفیسۆر (ڕ. فات) شیعرێکی پێشکەش کردووە.

زۆربەی ئەفسانە و داستانە کوردییەکانم لە خۆمدا هەڵگرتبوو.

یەشار کەمال درێژە بە قسەکانی دەدا و دەڵێ:

– من لە گوندێکی تورکمانان گەورە بووم. ئەوەی لەبارەی کوردەوە دەمزانی هەر ئەوە بوو کە لە ماڵەوەم گوێ لێ بووبوو. بۆ یەکەم جار گوێم لێ بووبێ باسی ڕاپەڕینی کوردان کرابێ، دیسان هەر لە ڕێگەی لاوک و گۆرانییە میللییەکان و داستانەکانەوە بوو. من لە باوکمەوە بیستم کە مامی ئەو، واتە میری کورد (گولیخان بەگ) گوێزرا بووەوە ئێرە، بە خۆی و بە ماڵ و منداڵەوە لێرە لە تاراوگەدا دەژیا. یەکسەر زوو لە هۆیەکانی تێ گەیشتم. پیاوێکی دینیی کورد، (شێخ سەعید)، ڕێبەرایەتیی ڕاپەڕینی کوردەکانی کردبوو، ڕووبەڕووی لەشکری تورک بووبووەوە و لە ئاکامدا تێک شکابوو.

ئیدی، ئەو مامەی باوکی منیش، وەک هەموو سەرۆک عەشیرەتە کوردەکانی تر، بەناچاری ڕێگای تاراوگەی گرتبووە بەر. ئەو پیاوێکی ڕێکپۆشی بە شەخسیەت بوو، پایەدار، ردێنسپی. زۆر بەباشی بەهەردوو زمانی کوردی و تورکی قسەی دەکرد، بە شەوکەتێکەوە. شایەری عەشیرەتەکەشی هەر لەگەڵ ئەودا هاتبوو. تا بەرەبەیان لاوک و داستانی لەبارەی "هەرەسهێنانەکان" دەگێڕایەوە، لەبارەی شەڕ و شۆڕەکانی رابردوو؛ ئەو لاوژە و داستانانەی کە قارەمانەکانیان بە گژ عێراقی و ئێرانییەکاندا چووبوون. بە دوو رو درێژی بەیتی بەسەر کردەوە بەرزەکانی ماممدا هەڵدەگوت، بەسەر جەردە بەشەرەفەکان، بەسەر خاڵەکەم کە لە شەڕ کوژرابوو.

کابرای شایەر دەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو، میریش (مامەکەم) نازی بەم خزمەتەوە دەکرد: «شایەری وەکو خۆی لە دنیا نییە»، هەر کەسێک بیویستایە گوێی لێ رابگرێ، وای پێ دەگوت. ئایا هاوشانی داستانبێژێکی گەورەی وەکو (عەبدال زەینەکی) نەبوو؟ ناویم لە بیر چووەتەوە. وابزانم هەرگیز بەناوی خۆی بانگیان نەدەکرد، هەر پێیان دەگوت: "دەنگبێژ"، کە بە کوردی دەکاتە "Dengbej".

یەشار کەمال دەڵێ:

– ئێمە لەماڵەوە گۆرانییە فۆلکلۆرییەکانمان دەگوتەوە، ئەو گۆرانییانەی پێیان دەگوترێ «تورکوو Turku». مامەکەم دەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو، بەلاّم هەمیشە هەمان نەزمی دەگوتەوە، تەنیا چەند شیعرێکی تازەی دەخستنە سەر. ئەم گۆرانییە کوردییانە، سەرتاپای منداڵانی گوند دەهاتن گوێیان لێ ڕادەگرت؛ دەهاتن لە ژێر پەنجەرەی ماڵەکەمان یان لەودیو پەردە حەسیرییەکانەوە کۆدەبوونەوە.

من، پاشان، دەچووم قسەکانی (شیعرەکان)ی ئەو گۆرانییە کوردییانەم دەکردنە تورکی. وای لێ هات ماوەیەک هیچم نەما وەری بگێڕم: هەرکە دەستم بە گۆرانییەکە دەکرد، منداڵ لە ژێر پەنجەرەکەدا کۆدەبوونەوە، ئیدی چونکە هەموو شیعرەکانیان ئەزبەر کردبوو، هەموو لا پێکەوە گۆرانییەکەمان بەیەک دەنگ دەگوتەوە. گۆرانییەکە باسی گۆلی (وان)ی دەکرد، سۆزێکی غەریبیی قووڵی بۆ گۆلی (وان) دەردەبڕی. ئەم مەڵبەندە بەهەشتێک بوو لەسەر زەمین».

یەشار کەمال دەڵێ:

– تەمەنم هەشت ساڵان بوو، لاوکبێژی کورد، عەبدال مووسا، جارێکیان داستانێکی بە کوردی لەبارەی چقوورئاوا بۆ گێڕامەوە، کە دەچووەوە سەر داستانەکانی داستانبێژی کورد عەبدال زەینەکی. ناواخنی ئەو داستانە بە شان و باڵی (محەمەد پاشای سوورەملی)، فەرمانڕەوای گەورەی کوردی هەڵدەدا، کە کاتی خۆی بە خۆی و سوارچاکەکانیەوە رژابوونە ئەو دەشتە بۆ ئەوەی شەڕ لەگەڵ فەرمانڕەوای تورکمانەکانی قۆزان ئۆغلّوو Kozanoglu بکات.

## لەیلا بەدرخان

ئەستێرەیەکی سەما و مۆسیقای کوردی لە ئەوروپای ساڵانی سییەکاندا



لەیلا بەدرخان لە ساڵی ١٩٠٨ لە ئەستەمبۆڵ لەدایک بووە. قوتابخانەی باڵای هونەری بالیەی لە ئەڵمانیا تەواو کردووە. لە ساڵی ١٩٢٥ بەولاوە دەستی بەچالاکیی سەر شانۆ کردووە.

لەیلا بەدرخان لە ساڵانی ١٩٣٠ شووی بەهونەرمەندێکی پۆڵۆنی کرد، تا ساڵی ١٩٨٦ لە پاریس پێکەوە دەژیان. لە ساڵی ١٩٨٦ کۆچی دواییی کرد و کچێکی لە دوا بەجێ ما بەناوی Nevin (نیڤین) کە ئێستە لە فەرەنسا دەژی و لە رۆژنامەیەکی میسریدا کار دەکات.

لەیلا بەدرخان دەستەخوشکێکی نزیکی کچی محەمەد عەلی عەونی بوو، خاتوو دورڕەیە، کە ئێستەش هەر لە پاریس دەژی. مامۆستا شاکر فەتاح، تاقە نووسەرێکی کوردە، کە دێرێکی لەبارەی ئەم کچە سەماکەرە کوردە نووسیبێت لە ژمارە (٣)ی کۆواو نزار، ساڵی ١٩٤٨.

خاتوونە هونەرمەندی کورد، لەیلا بەدرخان، بێ ئەوەی تا ئێستە پێ بزانین، بەپێی ئەرشیف و سەرچاوە فەرەنسییەکان، دەردەکەوێ کە لە ساڵانی سییەکاندا، یەکێک بووە لە ئەستێرە هونەرییە هەرە پرشنگدارەکانی ژیانی شەوبێری و شەو ئاهەنگە مۆسقاییەکانی ئەوروپا، هەروەها رۆڵێکی گەورەی بینیوە لە ناساندنی سەما و مۆسیقای نەتەوەیی کورد بەخەڵکی ئەوروپا.

لە ئەرشیڤێکدا، کە بەم دواییە لە شێوەی دۆسیەیەکی دوازدە لاپەڕەییدا لە کتێبخانەی (لانگزۆ) لە پاریس دۆزیمانەوە[1]، باسی ئەوە کراوە کە کچە هونەرمەندی کورد (لەیلا بەدرخان) لە ساڵانی سییەکاندا چەندان ئاهەنگی مۆسیقا و سەمای کوردی جۆراوجۆری لە وڵاتەکانی ئەمەریکا، لە بەلجیکا، لە هۆڵەندا، لە سویسرا، لە ئیسپانیا، لە فەرەنسا، لە ئیتاڵیا.... پێشکێش بە خەڵکی ئەوروپی کردووە، بەم سەما و ئاهەنگە مۆسیقاییە کوردییانەشی، سەرکەوتن و ناوبانگێکی فراوانی لە سەرتاپای وڵاتە ئەوروپییەکاندا وەدەست هێناوە.

ئەم ئەرشیڤە، بێ ئەوەی بەروار و ساڵی نواندنی هەموو ئەو چالاکییە

هونەرييانەی ئەم کچە هونەرمەندەمان بە تەواوەتی بۆ دەستنیشان بکات، باسی ئەوە دەکات کە (لەیلا بەدرخان) لە فیتیڤاڵێکی هونەریی جیهانیشیدا، لە فیستیڤاڵی سالز بۆرگ Salz boug (نازانین لە چ بەروار و ساڵێکدا، بەڵام ئاشکرایە پێش ١٩٣٥/٥/٢٠) بەشدارییەکی چالاکانە و کارامانەی کردووە، هەروەها لە بەڕێوەبەرایەتیی دەزگـــای (Lascala de Milan) ئەندام بووە و شەرەفی ئەوەی دراوەتێ کە لە بالیەیەکی بەناوبانگی رۆژهەڵاتییانەدا رۆڵی بنچینەیی ببینێت: لە بالیەی (Respighi) بەناونیشانی (بەلقیس شاژنی سەبا (Balkis Reine desaba).[٢]

بەداخەوە ئێمە نەمانتوانی هیچ شتێک لەبارەی ژیاننامەی (لەیلا بەدرخان) ســـاغ بکەینەوە، تەنیـــا ئەوە نەبێ کـــە دەزانین، وەک لە ســـەرچاوە فەرەنسییەکانیشدا پەنجەنوما کراوە: لەیلا بەدرخان کچی عەبدورەزاق بەدرخانی شۆڕشگێڕی کوردە، کە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا، وێڕای چەندان رووناکبیرانی تری کوردستانی تورکیا پەڕاگەندەی دیوی ئێران ببوون و لە دەوروبەری ساڵی ١٩١٢ لە شاری (خۆئی) گیرسابوونەوە.[٣]

دیارە لەیلا بەدرخان لەو سەروبەندەی ساڵانی دەیەکاندا جارێ منداڵ بووە و ژیانی هونەریی دەستی پێ نەکردووە، هێشتا پەڕاگەندە و ئاوارەی ئەوروپا نەبووبوو.[٤]

ئاشکراشە کە دیدی ناسیولیستانە و بیری پێشکەوتنخوازانەی باوکی، رووناکبیرێکی دنیا دیدەی وەک عەبدورەزاق بەدرخان، کاریگەرییەکی زۆری نواندووە بەســەر پەروەردەبوونی روحی و هونەریی ئەم کـچـە هونەرمـەندە. ئەگەر کاریگەری ئەم بیرە ناسیونالیستە پێشکەوتنخوازەی باوکی نەبوایە، ئەوا هیچ کچە کوردێک لە ساڵانی سییەکاندا جورئەتی ئەوەی نەدەکرد کە ببێتە (سەماکەر) و بێت لە ئەوروپا بەدوای شۆرەتی خۆیدا بگەڕێ.

وەک لە هەندێ نووسراوەکانی ناو کۆوار و رۆژنامە فەرەنسییەکانی ئەو سەردەمەدا بۆمان ساغ کرایەوە: لەیلا بەدرخان، نەک هەر شارەزاییەکی قووڵ و فراوانی لەبارەی هونەری سەما و مۆسیقای فۆلکلۆری کوردیدا

هەبووە، بەڵکو ئەم هونەرمەندە (سەما و مۆسیقا)ی بە شێوەیەکی ئەکادیمییانە و زانستییانەش خوێندووە، وەک هەر هونەرمەندێکی کارامە و هاوچەرخی سەردەمەکەی خۆی، بە تەواوەتی لەم هونەرە شارستانییە دانسقەیەدا قاڵ بووەتەوە، بەرهەمەکانیشی: بەری داری کۆشش و تێ خوێندنەوەیەکی قووڵی ئەکادیمییانەی ئەون.

جگە لەمانەش شارەزاییەکی فراوانی لەبارەی هونەری مۆسیقا و سەما جۆراوجۆرە رۆژهەڵاتییەکان هەبووە. لە هەمان کاتدا مۆسیقای ئەوروپی و هەندێ لە سەما ئەوروپییەکانیشی باش ناسیوە، تەنانەت لە باری پراتیکیشیدا، بۆ نموونە لە سەمای (بالیە)دا، سەماکەرێکی خاوەن ئەزموون و کارامە بووە.(٥) دەردەکەوێ کە لەیلا بەدرخان، دوا بەدوای هەر ئاهەنگێکی سەما و هەر ئاهەنگێکی مۆسیقایی کە لە وڵاتێکی ئەوروپیدا گێڕابێتی- ئیتر رۆژنامە و کۆوارەکانی ئەو وڵاتە، بە لێشاوە راپۆرت و وتاریان لە بارەیەوە بڵاو کردووەتەوە، چاوپێکەوتنی رۆژنامەنووسییان لەگەڵ ساز کردووە. بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەشمان، ئێمە لێرەدا تەنیا ئەو سێ شەوئاهەنگەی شاری پاریسی بەنموونە دەهێنینەوە، کە لە خوارەوەدا بەدرێژی باسی دەکەین.

دوا بەدوای ئەم سێ شەوئاهەنگە، ژمارەیەکی زۆر لە رۆژنامە و کۆوار پاریسییەکانی ئەو سەردەمە، وەک فیگارۆ (Le figaro)، لیبێرتی (Le liberte)، دێب Les Sem aine)، تەنانەت کۆوارێکی ناودار و گرینگی وەک جیهانی مۆسیقا Le monde Musicl و (رێبەری مۆسیقا Guid Musical)ش وتار و راپۆرتی تەرخانکراویان لەبارەیەوە بڵاو کردووەتەوە، وێڕای چەندان وێنە و پڕوپاگەندە و بیر و بۆچوونی جۆراوجۆر.

کەواتە دیارە، لە وڵاتانی تریشدا (لە ئەمەریکا و لە هۆڵەندا و ئیتالیا و بەلجیکا و ئیسپانیا و سویسرا) بەهەمان شێوە، لە ماوەی گێڕانی ئاهەنگەکانیدا، رۆژنامە و کۆوارەکانی ئەو وڵاتانە راپۆرت وتاریان لەسەر بڵاو کردبێتەوە و ئێمە جارێ نەماندیبن.

ئەو ئاهەنگانەی کە لەیلا بەدرخان لە شاری پاریسدا گێڕاونی ئەمانەن:

١- ئاهەنگێکی فراوانی سەما و مۆسیقای کوردی لە ڕۆژی ٢٠/٥/١٩٣٥دا.
ئەم ئاهەنگەی لە شاری پاریسی، لە هۆڵی (مارسێلان بێر تێلوت -Centre Marcelin BertheLot)دا ساز کردووە. زیاتر لە پێنج دیمەنەسەمای پێشکێش بە جەماوەر کردووە، تیپێکی ئۆرکستراتی فراوانی لە ژێر سەرپەرشتیی مۆسیقاژەنێک بەناوی (مۆریس ناگژیار- Naggiar Maurice) هاوکاریی کردووە لە پیادەکردنی مۆسیقا و هاونەغمەکردنی سەماکانیدا.

ئەم ئاهەنگە سەربژاردەیەکی فراوان لە ڕووناکبیر و هونەرمەندانی گەورەی فەرەنسی بینیویانە، هەروەها چەند شەخسیەتێکی ناوداری عەرەبیش بۆ بینینی ئەم ئاهەنگە هاتوون. دوا بەدوای ئاهەنگەکەش، حەوت ڕۆژنامە و کۆواری جیاجیای پاریسی، وتار و ڕاپۆرتیان بەوێنەی جۆراوجۆرەوە لەبارەی ئەم ئاهەنگە بڵاو کردووەتەوە کە لە خوارەوە، لە هەریەکێک لەو وتارانە، چەند دێڕێکی هەڵبژاردە، بەنموونە پێش چاو دەخەین.

٢- ئاهەنگێکی مۆسیقا و سەمای کوردی لە کاتژمێر (٩)ی ئێوارەی ڕۆژی دووشەمی ٦/٢٤ ساڵی ١٩٣٥.

ئەم ئاهەنگە، پێش ساز کران، پڕوپاگەندەییەکی ڕەسمیی فراوانی بۆ کراوە، ئەفیشی گەورە و جۆراوجۆری بۆ ساز کراوە و لەگەڵ وێنەیەکی کچە هونەرمەندی کورد، لەیلا بەدرخان، بەشاری پاریسدا بڵاو کراوەتەوە. لە ئەفیشەکەدا بە فەرەنسی نووسراوە (لەیلا بەدرخان، کچە سەماکەری کورد لە سەما ڕۆژهەڵاتییە فۆلکلۆری و هاوچەرخەکانیدا). ئۆرکستراکە لە ژێر بەڕێوەبردنی خۆیدا بووە، مۆسیقاژەن: مۆریسی ناگژیار (Naggiar Maurice)، پیانۆژەن ئێرین ئایە تۆفا Iren Aitoff. ئەم ئاهەنگە لە هۆڵێکی گەورە و بەناوبانگی شاری پاریسدا بەناوی (رامز) / Grande salle rameau ساز کراوە. بلیتی ئەم ئاهەنگە: (٣٠) و (٢٥) و (٢٠) و (١٥) و (١٠) فرەنک بوو، لە چوار مەڵبەندی هونەری و مۆسیقاییی شاری پاریسدا فرۆشراوە، وێنەی سەر ئەفیشەکە بە کامێرای ستۆدیۆی (Iris) گیراوە.

٣- ئاهەنگێکی فراوانی مۆسیقای رۆژهەڵاتی.

بەداخەوە بۆمان ساغ نەکرایەوە داخوا ئەم ئاهەنگەی لە چ کات و رۆژێکدا ساز کردووە. بەڵام بەپێی ئەرشیڤێک کە لە بەردەستمانە، دەردەکەوێ، کە ئەم ئاهەنگەشی هەر لە هەمان شوێندا و لەگەڵ هەمان گرووپی مۆسیقاییەکەی پێشوودا ساز کردووە.

ئەفیشی ئەم ئاهەنگە، لە ئەفیشی ئاهەنگەکەی پێشوو زۆر گەورەترە. بەفەرەنسی لەسەری نووسراوە (میهرەجانی سەما رۆژهەڵاتییەکان. لەلایەن لەیلا بەدرخانەوە).

پرۆگرامی ئاهەنگەکە دوو بەش بووە، کە بە هەمووی لە یازدە دیمەنە سەمای جۆراوجۆر پێکهاتووە: خۆڕازاندنەوەی رەزا (میناتۆری فارس)، خالکوبیی فارس، دیلان (سەمای کوردی)، نیگای هیندی، هیرۆگلیف، سەمای درووزی، مار، گۆرانیی بووکگواستنەوە، ئاوازی دینداری، بەلقیسی شاژنی سەبا، بالاد، ئۆرکسترای ئەم ئاهەنگەش هەر لە ژێر بەڕێوەبردنی خۆیدا بووە.

بۆ هەمووو لایەکمان ئاشکرایە، لەیلا بەدرخان وەختێ کە ئەم ئاهەنگە کوردییانەی لە پایتەختی وڵاتە ئەوروپییەکاندا ئامادە و پێشکێش کردووە، واتە لە ساڵی ١٩٣٥دا: مۆسیقا و سەمای کوردی لە ناوەوەی وڵات (لە کوردستان)دا هێشتا بە هیچ شێوەیەک بەو شێوە تازە و فراوان و هاوچەرخەی خۆی لەدایک نەبووبوو، بۆیە لەیلا بەدرخان بە یەکێک لە یەکەمین ئەو ئافرەتە هونەرمەندە کوردانە لە قەڵەم دەدرێت کە هەوڵیان داوە بۆ بنیاتنان و بووژاندنەوە و بڵاوکردنەوەی هونەری سەما و مۆسیقای کوردی. بەداخەوە، ئەو هەموو یەکەتی و مەڵبەندە کولتوورییانەی کورد لە ئەوروپان و کەچی هەرگیز غەم لە کۆکردنەوەی ئەم جۆرە ئەرشیف و تێکست و دۆکیومێنتە مێژووییانە ناخۆن. ئەگینا شەیتان دەزانێ داخوا چەند نەوار و فیلم و کاسێتی ڤیدیۆیی ئەم کچە هونەرمەندە کوردە و هی دەیانی تریش ئێستە لە ئەرشیڤخانەکانی ئەوروپادا کەوتوون!؟

هەر بۆیە بەشتێکی سەیر نازانرێ کە گەلێک لە شارەزایانی مۆسیقا و هەروەها ئامێری مۆسیقاناسە ئەوروپییەکان، بۆ نموونە لەوانە (فرانسوا رێنێ ترانشیڤۆر) بنەچەی گەلێک لە ئامێرە مۆسیقاییەکانی رۆژهەلات، وەک (تەنبوور) و بوزک/بزخ (Bazuq) دەگێڕێتەوە بۆ کورد، دەڵێ کە لە سەرەتادا کورد ئەو ئامێرە مۆسیقاییانەی داهێناوە.(٧)

ئیتر بابزانین رۆژنامە و کۆوار فەرەنسییەکانی ساڵی ١٩٣٥، چ شتێکیان لەبارەی ئەم کچە هونەرمەندە کوردە نووسیوە.



## چەند نمونەیەکی ئەو نووسراوانەی کە
## لە رۆژنامە و کۆوار فەرەنسییەکاندا بڵاو کراونەتەوە[٨]

لەبارەی ئاهەنگەکەی (لەیلا بەدرخان): لە رۆژی ١٩٣٥/٥/٢٠

لەیلا بەدرخان کچە بەگزادەی کورد، بەسیحر و بەهای بەرزی سەماکانی، ئەمڕۆ لەلایەن جەماوەرێکی فراوانی ئەورووپییەوە ناسراوە.

ئەم کچە سەماکەرە کچی میر عەبدوڕەزاق بەدرخانە، هەر لە منداڵییەوە بەخت یاریدەی داوە کە خولیای لێکۆڵینەوە لە داوونەریتە دێرینەکانی خۆیانی بکەوێتە سەر، بەهەمان شێوەش رووبکاتە هونەری سەماکردن و خۆی تێدا قاڵ بکاتەوە.

هونەری سەماکردن لە ڕۆژگاری دێریندا لەلای ئەواندا رەگ و ریشەیەکی پیرۆز و کۆنی هەبووە، بەڵام ئەمڕۆ تێکەڵ بە داوونەریت و ژیانی رۆژانەی هەموو خەڵکەکە بووە، بەشێکە لە بەشەکانی کەلەپووری نەتەوایەتییان.

..... لەیلا بەدرخان بە سەما دڵڕفێنەکانی خۆیەوە، سەرکەوتنێکی دانسقەی وەدەست هێنا:

لە پاریس لە بەلجیکا، لە هۆڵەندا، لە ئیسپانیا، لە سویسرا، لە ئەمەریکا ... تاد وەرزی رابردوو، لە فیستیڤاڵی ساڵزبوورک پێمان کرا بەدیمانەی شاد ببین، هەروەها بەم دواییەش، لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتیی (سکالا دی میلان –



Milan la. Scala) رێک کەوتبوو بۆ ئەوەی رۆڵی بنچینەیی ببینێت لە بالیەی رۆژهەلاتییانەی Respihi بەناونیشانی (بەلقیس، شاژنی سەبا BALKIS (REINE DE SABA.

ئێمە باسی هەموو سیحر و دڵڕفێنییەکمان کرد کەم لە پێکهاتنی هونەریی ئەم کچە هونەرمەندە چەکەرە دەکات، ئەو کچە هونەرمەندەی، کە جوانی تام و بۆی سەماکانی ئۆبەهەت و سیحری رۆژهەلاتی دێرینت لەلا زیندوو دەکاتەوە، لەیلا بەدرخان، کە لە لێهاتووییدا خاوەن دەستاوەردێکی یەکجار فراوانە، بەهرەی خۆی لە چەند سەرچاوەیەکی جۆراوجۆرەوە هەڵێنجاندووە.. کەلەپووری میسری، میناتۆری فارسیی سەمای دینداری Rituelle یا سەما فۆلکلۆرییە رۆژهەلاتییەکان.

ئەو کچە لە لێهاتوویی خۆی، شەخسیەتێکی ئەفسانەییت لە بەرچاو زیندوو دەکاتەوە، وێڕای شکۆمەندییەکی پڕ لە ویقار کە ئەمە لەلای ئەودا، دەتوانێ بڵێی کە شتێکی زگماکە.

Geroges Mussy

Le Figaro / 1 juin 1935 رۆژنامە

... بەژن و بالا جوان، لەش هەنگاوی، کە بەهیچ شێوەیەکیشی لە ئاریستوکراتییەت بەدەر نییە کچە سەماکەری کورد، لەیلا بەدرخان لە هۆڵی بنکەی مارسیلان بێر تولۆن Berthelot Marcelin ئێمەی بەرەو هیندستان، بەرەو ولاتی فارس، بەرەو میسر گەڕاندەوە، قەد و بالای لە هەر چاوتروکانێکدا پێکهاتنێکی ئارسیتیکوریانەی تا بڵێی مەبەستاویی -Ex pessive بە دەستەوە دەدا، بازووەکانی لە نەرمیدا وەک مار وا بوون لە خزیندا، ئادگاریشی بە تەواوەتی وەک شیعر، بە ئاخێزێک دڵیان دەرفاند جلوبەرگێکی قەشەنگ قەد و بالای داپۆشیبوو.

[carol]Berardo

[Echo de paris: Mai «کۆوار»]

.... کــچــه ســهمــاکــهری بهگــزادهی کــورد و لهیلا بــهدرخــان، پرۆگــرامــێکی ڕهنگاوڕهنگ و تا بڵـــێی زیندووی پێـــشکێش به ئێـــمـــه کـــرد. شـــهپۆلـه نهرمونیانهکانیم زۆر بهدڵ بوو. ههموو ئهندامێکی لهشی، لهگهڵ ههر ترپهیهکی ئاوازی مـۆسـیـقـاکـه دهلـهرایهوه، ئهم هونـهره لهلایهن ئهوهوه له ئـهنجـامی تێ خوێندنهوهی چهند سهرچاوهیهکی قووڵهوه ئاماده کرابوو که فۆلکلۆر تێیدا بوو شێوازێکی هاوچاخان، بهبێ ئهوهی شێلو بکرێت.

[Pierre Wolf]

[La Liberte: Mai 1935 کۆوار]

.. سـاڵۆنـێکی ڕازاوهی پڕ له جـهمـاوهرێکی بهباق و بـریق پێـشـوازی لـه لهیلا بهدرخان دهکا.

... هونهری ئهم کـچـه، کـه سـهرچاوهکـانی لـه رۆژههڵاتهوه، ههڵدهقـووڵێ، له پێـــوهندیکردنی به ژیانی رۆژئـاواییـــیـــهوه بهرهـهمـــێکی پـاڵێـــوراوی تازهی بهدهســـتـــهوه دا؛ بهبێ ئهوهی بههـیچ شـێـوهیهک بۆ و بهرامـــهی تهڵزمـــاویی داوونهریته پیرۆزهکانی رۆژههڵات بدۆڕێنێ.

... مۆسیقاکهی (م. ناگژیار M. NAGGIAR) واتهیهکی شکۆمهندانهی به رهنگه هـارمـۆنیـیـه رۆژههڵاتیـیـهکـان بهخـشـیـبوو. هـهروهها به جلوبهرگی کهشخهی ئهو کچه هونهرمهنده جوانه.

هاوکـارییـهتیی دیکۆرسـازانهی رۆح لـه نێـوان مـۆسـیـقـا و دیده هونهرییـه سازگار و تایبهتییهکهی هونهرمهندان ههبوو.

[La Sem aine a Paris: jun «رۆژنامه»]

کچـه بـهگزادهی کورد- خـاتوو بهدرخـان- کـچی مـیر عـهبدوڕهزاق بهدرخـان، لهسـهر شـانۆی M-B بهدرێژاییی شـهو، چهند سـهمـایهکی دڵڕفـێنی پـێشکێش کردین: بهرامبـهر جهماوهرێکی سهربژارده، کـه چهند شـهخسـیهتێکی عـهرهبی ناوداریشیان تێدا بوو.

.. ئەم کچە هونەرمەندە، کە ماوەیەک لەمەوبەر، لە بنکەی (scata de Mil am La) رۆڵی یەکەمی لە بالیەی M.R وا بەناونیشانی (بەلقیس شاژنی سەبا) داگیرابوو، جوانییەکی پەیکەرنومای هەیە.

جوانی هەیئەت و ئادگاری، مەگەر تەنیا لە جووڵانەوە هاوئاهەنگەگانیدا هاوتای هەبێ. شێوازی سەماکردنی سەرچاوەی خۆی لە سەما میمۆلۆجیکە Mimologique دێرینەکانەوە وەرگرتووە، ئەو جۆرە سەمایەی کە بەدرێژایی چەندان سەدە لە وڵاتەکەیاندا باو بووە.

ئاسەواری چەندان کاریگەرییەتیی جۆراوجۆر و یەکانگیر بەسەماکانیەوە دیار بوون: کاریگەریەتیی سەمای هیندی، لەلایەکی ترەوە فارس، هەروەها جگە لەمانەش تورکی. خاتوو بەدرخان هەموو ئەمانەی لەبەر یەکتر دانابوون؛ نواندنە رۆژهەڵاتییەکانی پێشکێش کردین، بریتی بوون لە چەند ئیماژێکی پڕ لە بزاوتی ئەوتۆ کە سەما فۆلکلۆرییەکە لە رێگای ئەو نواندنانەوە گەیشتبووە ئاستی دەربڕینێکی رۆحی و هونەری ئەم کچە تام و بۆیەکی تایبەت و ناوچەییانەی زۆر دیاری هەیە.

[Maurice Imberto]

[Les Debats: 27, Mai 1935 «رۆژنامە»]

کچە بەگزادەی کورد، لەیلا بەدرخان، لەو ئاهەنگەدا، چەند سەمایەکی تا بڵێی لە بەردڵ و قەشەنگی نەتەوەییانەی سەر بە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێشکێش کردین.

سیحرە شەخسی نەتەوەییەکەی ئەم کچە هونەرەکەی، لە داوونەرێتێکی پڕ لە بزاوتەوە، لە کانگەی ژیان- خۆیەوە هەڵقوڵابوون، هاوکات لەگەڵ مۆسیقایەکی رەسەن و هاوشانی خۆی، کە M-N ئامادەی کردبوو بەشێوەیەکی زۆر ئۆرکستراکەدا دەگێڕا.

[J. Baudry]

[Guide Musical: Juin, 1935 «کۆوار»]



*Respighi'nin Saba Melikesi Balesi. Libretto Guastalla, dekor Benois, koreografi Massine. (Dancing Times, 1932)*



دوو لەو هۆڵانەی کە لەیلا بەدرخان کۆنسێرتی تێدا ساز داوە لە ئەوروپا



23-30 Kasım, 7-14 Aralık dans programı, arka sayfada 24 Haziran gösterisinin aldığı eleştirilerden alıntılar yer alıyor



QUELQUES EXTRAITS DE PRESSE
*du Récital donné par Leila BEDERKHAN*
à la Salle Pleyel, le 24 Juin 1935

[illegible]
*Emile VUILLERMOZ.* — EXCELSIOR.

[illegible]
*Pierre WOLFF.* — LA LIBERTÉ.

[illegible]
*Carol BÉRARD.* — ÉCHO DE PARIS.

[illegible]
*Pierre BERLIOZ.* — LE JOUR.

[illegible]
*Maurice IMBERT.* — LES DEBATS.

[illegible]
*Maurice J. CHAMPEL.* — COMŒDIA.

[illegible]
*Georges MUSSY.* — LE FIGARO.

[illegible]
*L. HUMBERT.* — LE MONDE MUSICAL.

[illegible]
*Léo RYCK.*
LA TRIBUNE DE LA DANSE.

.. ئەمە بینینێکی هونەریی دانسقەیە، بەڕاستی کە ئەم کچە سەماکەرە کوردە، لەیلا بەدرخان، پێشکێشمانی دەکا... وێڕای هەموو ئەمانە، شتێکی تریش لەلای لەیلا بەدرخاندا هەیە، کە نرخێکی تایبەتی بۆ دادەنرێ:

خەسڵەتی سروشتییانەی قەد و باڵای جوان و رەسەنی، کە جووڵانەوە نەرم و وێنانەکانی، پێکهاتنی جەماوەرییانەی ئەوتۆ ساز دەکەن کە تا بڵێی نەشئاوی و لەزەتبەخش؛ هەمیشەش لەگەڵ ئەو ریتم و ئاوازە جۆراوجۆرانەی کە لە مۆسیقای فۆلکلۆریی سەر زەمینی ئیسلامەوە هەڵدەقووڵێن، هاوئاهەنگ دەبنەوە.

بۆ نموونە، ئێمە دەزانین کە یەکە یەکەی جووڵانەوەکانی ئەو سەمایەی کە ناوی Hyeroglyphe بوو، لە ئەنجامی تێ خوێندنەوەیەکی قوڵی پشت بەستراو بە کۆمەڵێک دۆکیومێنت داهێندرا بوون.

لەیلا بەدرخان و هاوکارەکەی دوو ساڵی رەبەقیان پێ چووە تا توانیویانە ئەم دیمەنە مۆسیقاییە دابهێنن، ئەمەش بۆ ئەوان کارێکی زۆر سروشتی و ئاساییە.

L. Humbert

Le Mon de Musical: Mai, 1835 «کۆوار»

ژێدەر:

١– کۆد و ژمارەی ئەم ئەرشیڤە ئەمەیە: (Mel-8-917-22-) لە کتێبخانە

Bibhotheque Interuniversitaire des

«Langues Orientales

٢– هەمان ئارشیف. ژمارە بۆ لاپەڕەکانی دانەنراوە. بڕوانە لە لاپەرەی «پێشەکییەکە» بە خەتی درشت نووسراوە.

٣– بۆ ژیاننامە و خەباتی رووناکبیرانەی (عەبدورەزاق بەدرخان) بڕوانە (جليلي جليل: نهضة الاكراد الثقافية والقومية. ترجمة باقي نازى،. ولاتو، كلدر، الطبعة الاولى: ١٩٨٤، ص٦٥–٨٨).

٤- بەپێی قسەی کاک (محەمەد ئۆزوون): تا ١٩٨٦ لە پاریسدا ژیاوە لە ژیان دابووە.

٥- هەمان ئەرشیڤ و پێشەکییەکە، هەروەها ئەو کۆوار و ڕۆژنامە فەرەنسییانەی لەم وتارەدا ناومان بردوون و پشتمان پێی بەستوون.

٦- بۆ هەر زانیاری و قسەیەکی لێرە نووسیبێتمان، پشتمان بە ئەرشیڤەکە خۆی بەستووە.

7- francois- ReneTranchefort

Les ins truments de Muiquedans Lemond

«ئامێرە مۆسیقاییەکان لە جیهاندا»

.seuil, paris:1980 P. 159, 160, 100. Volume (1), Edition du

بڕوانە لاپەڕە ١٦٠، ١٥٩، ١٠٠

٨- ئەم کۆوار و ڕۆژنامە کۆنانەم، هەندێکیان لە ئەرشیڤخانەی (ژۆرژ پۆمپیدۆ)، هەندێکی تریشم لە ئەرشیڤخانەی (ڤێغسای- کە تایبەتە بە تەنیا ڕۆژنامە و کۆوار کۆنەکان) پەیدا کردوون. ئەم ژمارە دیاریکراوانەی ئەو بڵاوکراوانە، پڕن لە وێنەی جۆراوجۆری خاتوو بەدرخان بەڵام بەداخەوە فۆتۆکۆپیکردنی هەموویان ئەستەم بوو.

## جیاوازیی نێوان حەیران و قۆریات

له ڕۆمانی (حەکایەتەکانی باوکم) وەرگیراوە

– چ حەیرانبێژێک لە گوندەکەی خۆی زیاتر، یان لە چەند گوندێکی دەوروبەری گوندەکەی خۆی زیاتر دنیای دیوە؟

بیرێکم کردەوە و گوتم: خۆ ڕاستیش دەکا.

شەهابەی هونەرمەند پرسیارەکەی خۆی بەشێوەیەکی تر دووپات کردەوە:

– چ لاوکبێژێک.. لە چەند گوندێک زیاتری دنیا دیوە؟ مەگەر ئەوپەڕی، جار



بەجارێک، بۆ لای دختۆر یان بۆ کار و کاسبییەک سەرێکی لە هەولێر دابێ!

شەهابەی هونەرمەند ویستی مەبەستەکەی ڕوونتر بکاتەوە:

– حەیرانبێژ سەبارەت بەوەی لە گوند ژیاون ئەزموونی شار و جەنجاڵیی ژیانی شارستانییان نەدیوە.. تەنانەت تاقیکردنەوەکانی عاتیفی و ڕۆحیشییان زۆر سادە و ڕووکەشانەیە، چونکە نەیاندیوە، دوور و مەحرووم بوونە لە جەستەی ژن و لە هەرچی شتێک کە ناوی ژیانی مەدەنیەتە.

حاجی پووشۆ مژی قووڵی لە نێرگلەی لیمۆکەی دەدا و سەری پەسندکردنی بۆ قسەکەی شەهابە ڕادەوەشاند.

– بۆیەش دەبینی کە حەیران لە وەسفکردنێکی عاتیفییانەی حەیرانبێژێک زیاتر بۆ جوانیی ئافرەت و سروشتی گوند.. هیچی تر نییە. حەیران، تەنانەت لاوکیش، پەساپۆرتی پەڕینەوەی بۆ ناو دەردە کۆمەڵایەتی و ئینسانییەکانی ناو شار پێ نییە. هیچ حەیرانبێژێک نەهاتووە تەعبیر لە ئینسانی ناو شار بکا، نەیتوانیوە پەی بەدەردی ژیانی مەدەنی و گرفتارییەکانی ئینسانی ناو شار ببا.

حاجی پووشۆ چاوەڕێی دەکرد پێکە وێسکییەکە بکا بەسەر دەمی خۆیەوە:

– کەواتە حەیران هونەرێکی بەتەواوەتی گوندییە.

شەهابەی ئوستادی مەقامات دەتگوت مامۆستایە و دەرسێکمان بۆ ڕاڤە دەکا، زۆر کەیفی هات کە حاجی پووشۆ گوتی «کەواتە حەیران هونەرێکی بەتەواوەتی گوندییە».. پێ کەنی، گوتی: «بێگومان»:

– بەڵگە بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە ئەوەیە کە هیچ مەقامزانێکی شارستان بەهیچ شێوەیەک ناتوانێ حەیران خۆش بڵێ.

ئنجا دیسان زەردەخەنەیەک کەوتە سەر ڕووی:

– قەت گوێت لێ بووە عەلی مەردان حەیرانێک بڵێ؟

– ...

– قەت گوێت لێ بووە هابە لاوکێکت بۆ بڵێ؟

– مـشكۆ.. مـشكۆی خـۆمـان، یـان حـەیدەرە کـەچەڵ هـەرگـیـز توانیـویانە حەیرانێک بڵێن؟

–...

– نە مـــشکۆ نە حـــەیدەرە کـــەچەڵ نە هـابە.. منیش.. نـایزانـین؛ ناتوانین حەیران بڵێین. مشکۆ و حـەیدەر ئەگەر تاک و تەرا خـۆشیـان تاقی کردبێـتەوە، ئەوا وەک دەبینی سـەرکـەوتوو نەبوونـە. ناتوانن؛ چونکە ئەوان گـوندی نین و هیچ ڕۆحییات و سروشت و ئەزموونێکی گوندیشیان نییە.

من بیرم لەم شـیکردنەوە قووڵ و ڕاستـەی شەهابە دەکردەوە، لەبەر خـۆمەوە گوتم:

– ڕاستە.. حەیران هونەرێکی گوندییە.

شەهابە وەک ئەوەی بە هەلی زانیبێ ڕاستییەکی تریش بدرکێنێ، گوتی:

– بەپێچەوانەی قۆریات و مەقام..



حاجی پووشۆ قسەکەی بۆ تەواو کرد و گوتی:

– قۆریات هونەرێکی شارستانییە.

– مەقامیش.

من بیرم دەکردەوە، پرسیم: چۆن.. شەهابە؟

شەهابە گوتی:

– قۆریات و مەقام لە مەرگەساتەکانی ئینسانی شارستانەوە هەڵقوولاون، لە قوڕگی ئینسانی شارنشینەوە دێنە دەر. گوێ بگرە.. مشکۆ دەڵێ:

بودەلە..

بلبل قۆنار بودەلە

عومرم ئالن گێچتی

بێلە قاڵدم بوودەلە.

لەم قۆریاتە هەستێکی تراجیدیی پڕ سوێ بەرامبەر بەڕابووردنی زەمەن و ژیان هەیە، بیرکردنەوەیەکی حەسرەتاوی و قووڵیش لە هەمبەر مردن و تەنیا مانەوەی ئینسان! ئەمە هەستی هیچ ئینسانێک نییە لە گوند ژیابێ.

دوای ئەمە، حاجی پووشۆی بازرگان یەکسەر گوتی:

– قەن ئەتلانسن..

ور خەنجەر قەن ئەتلانسن

عزرائیل ئەڵمە جانم

قۆی بەڵەم قەنەت لانسن

حاجی پووشۆ کە ئەم بەیتە فرمێسکەی بەسەر شیعرەکەی پێشوو داوەراند، خەریک بوو چاوەکانی پڕ ببن لە ڕۆندک.. بۆ کوڕە بچکۆڵەکەی، کە دەمێک بوو نەیدیبوو. شەهابە گوتی:

– لەم پانتاییییە حەسرەتاوییەی نێوان ژیان و مردندا تاکەکەس، واتە قۆریاتبێژی شارنشین، هەموو ناخۆشی و قەرەباڵغییەکانی ژیانی تاقی

کردووەتەوە کە بریتییە لە ژیانی ناو شار و جیاوازە لە ژیانی سادە و خەیاڵ ئاسوودی گوند.

ئنجا شەهابە دەستی دڵدانەوەی لەسەر ملی حاجی پووشۆ لابرد و ڕووی کردەوە من:

– تۆ هەست ناکەی.. مام پیربال.. ئەو گرفتارییانەی لە ناو مەقام و قۆریاتدا باسیان لێ دەکرێ، گرفتارییەکانی ژیانی مەدەنی و کێشەی ئینسانی شارستانن نەک هی گوند؟

حاجی پووشۆ بەم پرسیارەی شەهابە خرۆشا، شەهابەی ڕاگرت:

– باڵ تاسننەن..

سوو ئیچتم باڵ تاسننەن

چۆخ مەردن یووخی یخلّدی

نامەردن بەڵتەسننەن.

شەهابە ڕووی لە من کردەوە و گوتی:



– دەبینی! خیانەتی ئینسان و سەرگەردانییە مرۆڤایەتییەکان، هاواری بێ فریادڕەسی تاکەکەس لە دەست دەوروبەری خۆی! نامۆیی و شکستهێنانی مرۆڤ لە ناو ژیانی ناو شار و جەنجاڵییە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەکان.. ئەمانە هەمووی بوونەتە ئەو قەهر و وشە و هاوار هاوارە نەبڕاوەیەی کە لە کانگای مرۆڤی شارنشینەوە، لە قوڕیاتەکانەوە هەڵدەقووڵێ.

حاجی پووشۆ دەستێکی ڕاتەکاند و گارسۆنێک یەکسەر هاتە لای. پێی گوت: «سێ قاپ بەدامچەی تەڕت لە بیر کردووە بۆمانی بێنی. زوو!». ئنجا حاجی پووشۆ، کە قاپی جاجیک و فستق و زەیتوون و مەزەکانی بەردەم شەهابەی ڕێک دەخست.. گوتی:

– من هەست دەکەم نەغمەی قوڕیاتبێژیش لە چاو نەغمەی حەیرانبێژ.. زۆر لە یەکتر جیاوازن؟ ئەمە مەسەلەی جیاوازیی قوڕگە.. شەهابە؟!

– تۆ چۆن قوڕگی ئینسانێکی شاخاوی لە قوڕگی گەرمیانییەک جودا ناکەیتەوە؟! نەغمە.. بێگومان جیاواز دەکەوێتەوە. نەغمەی حەیرانبێژی گوندی لە کوێ و نەغمەی قوڕیاتبێژی شارستان لە کوێ؟

من پرسیم: لە چیدا لەگەڵ یەکتر جیاوازن؟

شەهابە گوتی: نەغمەی قوڕیات دەگریێ و شیوەن دەکا.. هاوار دەکا لە دەست گرفتارییەکانی مەدەنییەت و دەناڵێنێ؛ بەڵام نەغمەی حەیران نەغمەیەکی گوندنشینی سادەیە.. پێ دەکەنێت و دڵی یەکجار خۆشە، پێ دەکەنێت و تەنیا وەسفێکی ڕووکەش و سادەی جوانییەکانی ژن و سروشت و گوندت بۆ دەگێڕێتەوە.. هەر دەڵێی یەکەمین جارە چاوی بە دنیا هەڵهێناوە.

حاجی پووشۆ گوتی:

– حەیران وات لێ دەکا دڵت خۆش بێ؛ قوڕیات وات لێ دەکا هەست بە تراجیدیای ژیان بکەیت و بیر بکەیتەوە.

من گوتم: بەڵێ، بۆیەش قوڕیاتبێژ هەمیشە داد و بێدادی لێ هەڵدەستێ. ئەم هەموو هات و هاوارە نابینی!

– وایە.

من ڕووم لە شەهابە کردەوە و پرسیم:

– شەهابە پرسیارێکی تر.. ئەدی بۆچی قۆریات و زۆربەی مەقامەکان، بە هی تۆشەوە، زۆربەیان بە تورکمانین.. بە کوردی نین؟

شەهابە گوتی: چونکە هونەرمەندی کورد بەدەست خۆی نەبووە؛ تەماشای کردووە زمانی ئیدارە و دەوڵەت هەمووی بەتورکمانی بووە.. ئەویش ناچار بووە بەتورکمانی بیر بکاتەوە و تەعبیر بکات.

پرسیم: یەعنی تورکمانیبوونی زمانی ئیدارە و دەوڵەت وای کردووە زمانی قۆریات و مەقام ببێتە تورکمانی؟

– بێگومان چونکە زمانی ئیدارە و دەوڵەت زمانی ناو بازاڕیشی کردووەتە تورکمانی.

– کەواتە قۆریات هونەرێکی کوردییە بەڵام بە تورکمانی.

– بێگومان؛ قۆریات هونەری کوردی شارنشینە بەتورکمانی.. چونکە.. ئێ خۆ مشکۆ و من و حەیدەرە کەچەڵ و هابە و زۆربەی قۆریاتبێژەکانی کەرکووکیش کوردین. کورد نین؟!

ئنجا گوتی: هەر ئەم بە تورکمانی چڕینەش بووە کە وردە وردە سیفەتی تورکمانبوونی بەخشیوەتە هەولێر.

– بەدەم شیرینتربوونی قۆریاتەوە لە ناو خەڵک، هەولێر سیفەتی تورکمانیبوونی خۆی لە قۆریاتەوە هەڵمژیوە.

– ئەمەش چونکە قۆریات و مەقام یەکجار کاریگەر و بەڕەواج ڕۆ چوونەتە دڵی هەولێرییەکان. نابینی! ئێستاش هەندێ خەڵک وا تێ دەگەن کە هەولێر تورکمانە.

حاجی پووشۆ گوتی: قۆریات هونەرێک بووە توانیویەتی کولتوورێک دروست بکات لە هەولێر: کولتووری تورکمانی!

من خەریک بووم بڵێم: «کەواتە تورکمانی لە هەولێر.. تەنیا کولتوورێکە»،

حاجی پووشۆ گوتی:

- بەپێچەوانەشەوە.

گوتم: مەبەستت چییە؟

حاجی پووشۆ گوتی:

- مانەوەی حەیرانبێژ لە ناو گوندەکانی دوورەدەستی ئیدارەی عوسمانی وای کردووە گوند بەردەوام کوردی قسە بکەن و کورد بمێننەوە.

شەهابە گوتی: بەڵێ.. قۆریات سیفەتی تورکمانیی بەخشیوەتە هەولێر، کولتوورێکی تورکمانیی لە ناو دڵی هەولێردا ڕواندووە. ئەمە لە کاتێکدا هونەرمەندی گوندنشین، بە لاوک و حەیرانەکانی، سیفەتی کوردبوونیان پاراستووە.

حاجی پووشۆ کلیلی لە گفتوگۆکە دا و گوتی:

- وەلحاسڵ.. حەیران گوندییە و قۆریات شارنشین.

شەهابە دەستی بۆ پێکەکەی برد:

- حەیران پێ دەکەنێ و قۆریات شیوەن دەکا.

ئنجا گوتی: دەزانی بۆ؟ چونکە حەیرانبێژی گوند، لە ناو سروشتی سادە و هێمندا دڵی زۆر خۆشە؛ بەڵام قۆریاتبێژ لە ناو شاری جەنجاڵ و بێ ڕەحمدا دڵی زۆر تەنگە.

لە شەهابەم پرسی:

- تۆ بۆچی دڵت تەنگە.. شەهابە؟

شەهابە بەم پرسیارەی من لەو پڕدووییەی هەیبوو ڕاوەستا. دەستی برد پێکێک تازەی عەرەقی بە پڕیی پەرداخەکە دروست کرد و یەکسەڵەف بە چەند قومێکی یەک لە دوای یەک بەیەکجار نای بەسەر دەمیەوە.. تا پەرداخەکەی هەمووی تەواو دەکرد. ئنجا پەرداخە بەتاڵەکەی دانایەوە و دوو کەوچک جاجیکی پڕ دەنکەسیری زۆر وردیشی بەسەردا کرد و گوتی:

– من پیسترین جەنگ و ناشیرینترین چەهرەکانی تەعەدا و برسییەتی و ئاوارەیی و غەدرم دیوە لەم هەولێرە..!

ئنجا گوتی:

– من عەینەن هەولێر؛ بەدەست تەعەدای تورکەکانەوە، بەدەست غەدری ڕووسەکانەوە، بەدەست زوڵمی ئینگلیزەوە، ئنجاش بەدەست ئەو هەموو شەڕ و غەدر و جڕ و جانەوەرانەی خۆمانەوە.. لە منداڵیمەوە تاکو ئەمڕۆ بەردەوام هەست دەکەم بەر گوللە دراوم. چۆن دڵم تەنگ نەبێ؟

شەهابە درێژەی بە قسەکانی دا:

– حەیرانبێژێک یان گوندنشینێک لەوانەیە ئەشکەنجەی تەنیا بەدەست غەدری ئاغا قورمساغەکەیەوە چەشتبێ، بەڵام من بەدەست نێزەی ڕووس و پۆستاڵی ئینگلیز و شمشێری تورکەکانیشەوە.. دنیایەک نەهامەتی و دەربەدەری و سەمەرگیی ئەوتۆی تریشم دیوە مەگەر تەنیا ناڵە و هاوارەکانی قۆریات دەرەقەتیان بێ..



## چەند وێنەیەک لە ئەرشیڤی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە

مێژووی مۆسیقا لە کوردستاندا بە وێنە

١- کچە کوردێکی مۆسیقاژەن. ئەرشیڤی: د. محەمەد موکری

ئەم تابلۆیە، لەگەڵ چەندان تابلۆی تر کە مێژووی ڕەونەقداری مۆسیقای کوردیمان بۆ دەسەلمێنن لە ئەرشیڤی د. محەمەد موکری وەرگیران.

تابلۆکە، ئافرەتێکی کورد پێشان دەدا لە کوردستانی ڕۆژهەڵات کە ئامێری ساز دەژەنێ.

ئەمڕۆ لە کۆماری ئیسلامیی ئێراندا قەدەغەیە بۆ ئافرەتی کورد ساز بژەنێ، کەچی لە سەردەمی ئەردەڵانەکانی سەدەی حەڤدەم و هەژدەمدا، ئەم تابلۆیە پێمان دەڵێ:

«ئافرەتی کورد، ئازاد، سازی ژەنیوە و گۆرانیی گوتووە».

٢- مۆسیقاژەنێکی دەروێشی کورد لە ریحا (ئورفە)/ کوردستانی باکور، ساڵی ١٨٩٠.

پرۆفیسۆری مۆسیقاناسی ئەڵمانی Felix Von Luschon لە ساڵی ١٨٩٠ لە گۆواری Das Volk Kurden لە بەرگی LVII لە ژمارە (٨)، لە وتارێکیدا بە زمانی ئەڵمانی، باسی مۆسیقا و گۆرانیی کوردانی کردووە و ئەم نیگارەی بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستەکانی بڵاو کردووەتەوە.

پێ دەچێ شاری ئورفە (کە ژمارەیەک لە عەلەوییەکانی تێدا دەژی) پاشانیش مۆسیقای دینی، لە ڕێگەی دەروێشەکانەوە، ڕۆڵێکی گرینگیان هەبووبێ لە بڵاوکردنەوە و پەرەسەندنی مۆسیقا و گۆرانیی کوردی. هەڵبەتا، ئەم گۆرانییە کوردییانەش، سەبارەت بەوەی زۆر بڵاو بوونەتەوە؛ هێدی هێدی چوونەتە ناو کولتووری تورکەوە و تورک ئەمڕۆ بە گەنجینەی خۆی دەزانێ و بەردەوام تا ئەمڕۆش سوودیان لێ دەبینێ. قەدەغەکرانی زمانی کوردیش لە تورکیا زۆرتر ڕێگەی بۆ ئەوە خۆش کردووە کە ئەم کولتوورە مۆسیقاییەی کورد بەناوی تورکەوە ناودێر بکرێ.

٣- چەند مـۆسـیـقـاژەنێکی کـوردی یەزیدی، کە سـەرچاوە ئینگلیـزییـەکـە بە (قـەوال) ناودێری کـردوون لە سـاڵی ١٨٥٣. لە کـتـێـبـەکـەی هنری لایار Henri LAYAR وەرگیراوە بە ناونیشانی (نەینەوا و بابلیۆن Niniveh and Babyon) کە لە ساڵی ١٨٥٣ لە لەندەن چاپی کردووە.

نووسەر لە کتێبەکەیدا بە زمانی ئینگلیزی، باسی یەزیدییەکان و مۆسیقا و گۆرانیی کوردیی کردووە و ئەم نیگارەی بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستەکانی بڵاو کردووەتەوە.

لەم نیگارەدا تەنیا ئامرازەکانی دەف و شمشاڵ بەکار هاتوون کە پێ دەچێ دوو ئامێری مۆسیقاییی باوی مۆسیقای پیرۆزی یەزیدییەکان بووبن.

٤- چەند مۆسیقاژەنێکی کوردی سنەیی (کوردستانی ئێران)، کە سەرچاوە ئینگلیزییەکە بە (مۆسیقاژەنی میزۆپۆتامیا) ناودێری کردوون لە ساڵی ١٨٥٦. لە کتێبەکەی ئەلێکس ڕووسێڵ Alex Russel وەرگیراوە بە ناونیشانی (مێژووی حەلەب History of Aleppo کە لە ساڵی ١٨٥٦ لە لەندەن چاپی کردووە.

نووسەر لە کتێبەکەیدا بە زمانی ئینگلیزی، باسی میللەتانی میزۆپۆتامیا و گۆرانیی کوردیی کردووە و ئەم نیگارەی بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستەکانی بڵاو کردووەتەوە.

لەم نیگارەدا چەندان ئامرازی جۆراوجۆر دەبینین. وەک دیاریشە مۆسیقاژەنی ناو دیوەخان و کۆشکێکی شاهانە دەنوێنێ، کە لە تیپێکی مۆسیقاییی پرۆفیشناڵ دەچن.

٥- دیپلۆماتی ئینگلیز، سی جی ئەدمۆنز C. J. EDMONDS کە ماوەیەکی زۆر لە ساڵانی چلەکاندا لە کوردستان بووە و پاشان کتێبێکی لەبارەی کوردەوە نووسیوە، لە ساڵی ١٩٥٧ ئەم وێنەیەی لە نێو کتێبەکەی خۆیدا چاپ و بڵاو کردووەتەوە. نیگارەکە، ڕەش و سپی، بە مووقەلەم کێشراوە. لەوانەیە مێژووی وێنەکە (مێژووی بینینی دیمەنەکە) بگەڕێتەوە بۆ کوردستانی ساڵانی سییەکانی سەدەی بیستەم. ئەوە نیشان دەدا کە مۆسیقاژەن و گۆرانیبێژی کورد چی لەبەر بووە، کێ بووە، چۆن بووە؟ گۆرانی و موزیک لای ئەو چیی گەیاندووە؟

وەک لە وێنەکەدا دیارە، پێ دەچێ ئەم گۆرانیبێژ و مۆسیقاژەنانە تیمێکی مۆسیقاییی کۆچەر یان گەڕۆکی کوردستان بن، بەڵام لە جلوبەرگیشیان دیارە گەلێک پۆشتە و تێروتەسەل بن.

ئەوەی جێی سەرنجە، چەند ئامێرێکی مۆسیقاییی جۆراوجۆرن کە لەم نیگارەدا هەن، بەڵام لە گەلێک نیگاری تری ڕۆژهەڵاتناسەکانی تردا نەماندیون. ئامێرە مۆسیقاییەکانی کە لێرەدا (لە کوردستانی عێراق) بەکار هاتوون شایانی لێ وردبوونەوەن.

٦- ئەم تابلۆیە لە ناو کتێبێکی دەسنووسی (داستانی خورشید و خاوەر بە زمانی کوردی) ڕەسم کراوە، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی حەڤدەم. یەکێکە لە تابلۆ هەرە کۆنەکانی دەستمان کەوتووە، کە لە بەستێنی مێژووی هونەری نیگارکێشانی کوردیشدا بایەخی پلەی یەکەمی هەیە؛ لە ئەرشیڤی ماڵی (د. محەمەد موکری) لە پاریس پارێزراوە.

لەم تابلۆیەدا دەبینین خورشید خاوەر لە دەستە ڕاست لە سەرەوەدا دانیشتوون، سێ کچی عازەبیش مۆسیقایان بۆ دەژەنن. یەکەمیان لە سەرەوە: ڕەنگوڵ دەژەنێ، دووەمیان لە خوارەوە لە دەستە ڕاست تەپڵ، سێیەم کچیش: کەمانچە (ڕەباب) دەژەنێ.

لە کەم تابلۆی ڕۆژهەڵاتناسەکاندا لەبارەی کورد ئەم سێ ئامێرە ڕەسم کراون.

لە هەمووی سەرنجڕاکێشتر ئامادەییی ژنان و کچانە لە ناو کۆڕی مۆسیقا و گۆرانیدا، کە مێژوونووسان زۆر کەم لە چاو ئەوەی کە مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە، باسیان کردووە. هەرسێ مۆسیقاژەنەکە وەک دەبینین: ئافرەتن.

٧- چەند مۆسیقاژەنێکی کورد لە قاوەخانەیەکی شاری وان لە کوردستانی باکور، لە ١٠ی مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ١٨٤٣ کێشراوە.

ئەم نیگارە کە بە مووقەلەم، بە ڕەنگی ڕەش لەسەر کارتۆن ڕەسم کراوە، لە سەرچاوەیەکی فەرەنسی، ساڵی ١٨٤٣ بڵاو کراوەتەوە، پاشان نووسەرێکی ئەرمەن بەناوی Sarkis Bogbossian لە پاریس لە ساڵی ١٩٨٧ لە کتێبی (Iconographie Armenienne) دووبارە بڵاوی کردووەتەوە.

ئەم نیگارە ئەوە دەسەلمێنێ کە لە ناو قاوەخانەکانی کوردستاندا مۆسیقایان ژەنیوە و گۆرانییان گوتووە (گێڕانەوەی حەکایەتەکانی لەیلا و مەجنوون و ئاسلّی و کەرەم و ڕۆستەمی زاڵ ... هتد، هەموویان بە گۆرانی و مۆسیقاوە گوتراون).

ئامێرەکانی لە ناو ئەم تابلۆیەدا دەردەکەون: ساز و ڕەبابن.

٨- ئەم نیگارە کە بە مووقەلەم بە ڕەنگی ڕەش لەسەر کارتۆن ڕەسم کراوە، وێنەی لەشکرێکی کورد پێشان دەدا بە سەرۆکایەتیی خا قارەمانێکی کورد، خاتوو (قەرە فاتم) کە چۆن بەپێش لەشکرەکە کەوتووە و لە دواوەش چەند مۆسیقاژەنێک (زورناگێوێک) و دوو (دەهۆڵکوت) حەماسی لەشکرەکە بەهۆی مۆسیقاوە بەرز دەکەنەوە.

ئەم تابلۆیە کە لە ساڵی ١٨٥٦ لەلایەن ڕۆژهەڵاتناسێکی ئینگلیزەوە ڕەسم کراوە، سەلمێنی ئەوەیە کە کورد لە کاتی شەڕ و هێرشبردندا مۆسیقایان بەکار هێناوە.

سەرچاوەی ئەم تابلۆیە:

Lady Sbeil: Glimpses of life and Manners in Persia, London: 1856

٩- سەمایەکی ژنانی کورد پێشان دەدا لە کوردستاندا کە چۆن لە ناو پیاوان بەئازادییەوە بەدەم بیستنی گۆرانییەوە هەڵدەپەڕن. پیاوێک بلوێریان بۆ لێ دەدا و پیاوێک کە دانیشتووە تەپڵ لێ دەدا، پیاوێکی تریش (شایەر) لە ناوەڕاستدا گۆرانییان بۆ دەڵێ. بەرامبەریشیان ڕیزێک پیاو کە ئەوانیش شایی دەکەن.

ئەم تابلۆیە بە ناونیشانی (سەمای ژنە کوردەکان) لە ساڵی ١٨٣٨ ڕەسمکراوە و لەلایەن ڕۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسی بەناوی J.M. Chopin لە کتێبی Russie لە پاریس بڵاو کراوەتەوە.

من وا تێ دەگەم ئەم وێنەیە لەسەر بنچینەی وێنەیەکی ڕۆژهەڵاتناسی ئینلیز (مستەر ڕیچ) ڕەسم کراوە کە لە ساڵی ١٨٣٢ لە کتێبەکەی خۆیدا بڵاوی کردووەتەوە و باسی گۆرانی و مۆسیقا و ڕەشبەڵەکی کوردانی کردووە.

١٠- مۆسیقای دینی، له ڕێگەی دەروێشـەکانەوە، ڕۆڵێکی گرینگیان هەبووە لە بڵاوکـردنـەوە و پەرەسـەندنی مـۆسـیـقـا و گـۆرانـیی کـوردی. ئەم وێـنـەیە، کـە مۆسیـقاژەنێکی دەروێشی کورد لە ریحا (ئورفە) لە کوردستانی باکور پێشان دەدا، نموونەی بەڵگەی سەلماندنی ئەم ڕاستییەیە.

پرۆفیسۆری مۆسیقاناسی ئەڵمانی Felix Von Luschon لە ساڵی ١٨٩٠ لە کۆواری Das Volk Kurden لە بەرگی LVII لە ژمارە ٨، لە وتارێکیدا بە زمانی ئەڵمـانی، باسی مـۆسـیـقـا و گـۆرانیی کـوردانـی کـردووە و ئەم نیگارەی بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستەکانی بڵاو کردووەتەوە.

تێبینی: شاری ئورفە ژمارەیەک لە عەلەوییەکانی تێدا دەژی.

ئەم مـۆسـیـقـاژەنە پیـرە خـەڵکی شـاری ئورفـەیە. ئیـبـراهیم تاتـڵـیسـازی کوردیش خەڵکی ئورفەیە.

باوەڕ ناکەم باپیرە گەورەی «تاتڵیساز» بێت.

١١- پۆستكارتێكی ئێرانی، كه له زه‌مانی ڕه‌زا شای په‌هله‌ویی ئێراندا (كۆتاییی سه‌ده‌ی نۆزده‌م و سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی بیسته‌م) له‌لایه‌ن وه‌زاره‌تی ڕۆشنبیریی ئێران، واته به‌شێوه‌یه‌كی ده‌وڵه‌تی چاپ كراوه. وێنه‌ی سه‌مایه‌كی (ڕه‌شبه‌ڵه‌كی) كوردان پێشان ده‌دا كه چۆن ژن و پیاوی كورد (كچ و كوڕ) ده‌ستی یه‌كتریان گرتووه له شاییدا. پۆستكارته‌كه پوولی زه‌مانی شای لێ دراوه و ڕه‌وانه‌ی ئه‌وروپا كراوه.

ئه‌م پۆستكارته ئه‌وه ده‌سه‌لمێنێ كه شاهه‌نشایه‌تیی ئێران ویستوویه‌تی شانازییی به مۆسیقا و هونه‌ری سه‌مای كوردییه‌وه بكات له هه‌مبه‌ر دنیای ڕۆژئاوادا.

سه‌مای كوردی هونه‌رێكی تازه و ئه‌مڕۆیی نییه، به‌ڵكو دێرینه.

# مێژووی ئێزگە و پەخشی ڕادیۆیی بە زمانی کوردی

لەم کرۆنۆلۆجیایەدا، من مێژووی ڕادیۆ بە زمانی کوردی، دابەش دەکەمە سەر چوار قۆناغ:

قۆناغی یەکەم: سەرەتا و ناسین (١٩٢٣- ١٩٣٩)، واتە ئەو ماوەیەی کە ڕادیۆ بۆ یەکەم جار دێتە ناو خەڵکی کورد و بۆ یەکەم جار دەست دەکرێت بە پەخشی یەکەمین بەرنامەکان بە زمانی کوردی.

قۆناغی دووەمیش: قۆناغی پەرەسەندن (١٩٣٩- ١٩٦٣) کە پێوەندیی بە جەنگی دووەمی جیهانییەوە هەیە، ئەمەش چونکە خەباتی پڕوپاگەندەیی بۆ جەنگی یەکەمی جیهانی، هەلومەرجێکی گونجاو بۆ گەشەسەندنی ڕادیۆ و پەخشی ڕادیۆیی بە زمانی کوردی دەڕەخسێنێ: دەوڵەتە گەورەکان و دراوسێ



چەند کادیرێکی رادیۆی کوردی

ڕادیۆیان بە زمانی کوردی بەکار هێنا بۆ ئامانجە سیاسییەکانی خۆیان.

لە قۆناغی سێیەمیشدا: (واتە لە ١٩٦٣ بەملاوە) کورد توانی ڕادیۆ باشتر بناسێت و لە هونەری ئێزگە و پەخش واتە لە تەکنۆلۆجیای ڕادیۆدا و وەک میدیایەکی کاریگەر تێی بگات و بەکاری بهێنێ لە پێناو ئامانجە نەتەوەییەکانی خۆی و بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی خۆی.

لە ئاکامدا دەتوانین بڵێین: ڕادیۆ بە زمانی کوردی، هەرگیز لە پێناو بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی خودی کورد – خۆی نەبووە: تەنیا لەو سالانە بەملاوە کە کورد خۆی ڕادیۆی خۆی لە پێناو خەباتی نەتەوەیی خۆی دادەمەزرێنێ: ١٩٦٣.

لە هەموو حاڵەتەکانیشدا، ڕادیۆ تا ڕاپەڕینەکەی بەهاری (١٩٩١) لە ئامرازێکی ئایدیۆلۆجی و خەباتی سیاسی بەملاوە، ڕۆڵێکی ڕۆشنبیری و پەروەردەیی و هونەریی ئەوتۆی نەبووە بە واتا مۆدێرنەکەی ئەمڕۆ.

لە کاتی نووسینی ئەم کورتە وتارەدا ئەوەشم بۆ ڕوون بووەوە کە گەلی کورد – سەرەڕای بێ دەوڵەتی و نەبوونی هیچ قەوارەیەکی سیاسیی نەتەوەیی–، کەچی پێش گەلانی فارس و تورک و عەرەب ڕادیۆی هەبووە؛ واتە ڕۆژنامەڤان و ڕۆژنامەنووسانی ڕادیۆیی کورد، پێش ڕۆژنامەنووسانی گەلانی تورک و عەرەب و فارس ڕادیۆیان ناسیوە و بەزمانی کوردیی خۆیان قسەیان لە ڕێگەی ڕادیۆوە کردووە. من ئەمەم بەلاوە گرینگە و بۆ هەموو توێژەرێکی کورد و بێگانەش شایستەی وردبوونەوە و قسە لەسەرکردنە!

فراوانترکردنی لچک و لێوارەکانی ئەم کورتە وتارەی من، بێگومان کارێکی زۆر بەسوود دەبێ بۆ تێگەیشتن لە قۆناغەکانی گەشەسەندنی (ڕۆژنامەگەریی ڕادیۆیی) و پێشکەوتنی مۆسیقا و گۆرانیی کوردی، هەروەها نەشونمای تەکنەلۆجیای ڕادیۆ و هونەرەکانی (نواندنی ڕادیۆیی) و (درامای ڕادیۆیی) و وتاری ڕادیۆیی و.. هتد. چونکە وەک ئاشکرایە، ڕادیۆ – بەتایبەتیش ڕادیۆی کوردی لە سالانی ڕابردوودا – بنکەیەکی پەخشی کاریگەر و بەهێز بووە بۆ

بڵاوکردنەوەی مۆسیقا و گۆرانیی کوردی (هەموو هونەرمەندە مۆسیقاژەن و گۆرانیبێژەکانمان لە سەرەتادا لە ڕێگەی ڕادیۆوە خۆیان بە جەماوەر و گوێگرانی خۆیان ناساندووە: هەر لە عەلی مەردان و مریەم خان و کاوێس ئاغاوە بگرە تا دەگاتە ئایشە شان و محەمەد قەدری)، لە هەمان کاتدا ڕادیۆ لانکەیەکی میهرەبان بووە بۆ پەروەردەکردنی هەستی نیشتمانی و چێژی هونەری و ڕۆشبیری، هەمدیس بۆ گەشەسەندنی بیری ڕەخنەیی و کاری ڕۆژنامەنووسیی ڕۆژنامەڤانانیش.

ئەمە جگە لەوەی کە ئەو مێژوونووسانەی لە مێژووی سیاسیی کوردستان و پێوەندییە ناوچەییەکانی کوردستان بە دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان دەکۆڵنەوە؛ هەڵبەتا سوودێکی یەکجار زۆر لەم مێژووە دەوڵەمەندەی ڕادیۆی کوردی دەبینن. ڕۆژنامەگەریی ڕادیۆییی کورد، ئاشکرایە، ئەگەر لە هەموو سەردەمێکیشدا لە کانگای بزاڤە نەتەوەییەکەوە هەڵنەقوولاّ بێ، ئەوا پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەناسنامە و هەبوونی تراجیدیی خۆیەوە هەبووە: با وەک کارتێکیش لەلایەن هێزی بێگانەوە بەکار هاتبێت!

مێژووی ڕادیۆی کوردی، وەک لەم کرۆنۆلۆجیایەدا دەبینین، بریتی بووە لە مێژووی سیاسەتی ئەو دەوڵەتانەی کە پێوەندیی ئۆرگانیک و ڕاستەوخۆیان بە کوردستانەوە هەبووە لەو ساڵانەدا.

پێش ئەوەی ئەم کورتە کرۆنۆلۆجیایە لەبارەی مێژووی ڕۆژنامەگەریی ڕادیۆیی پێش چاو بخەم، ئاواتەخوازم هیچ نەبێ بەشێک لە کەرەستە گرینگەکانی ئەم مێژووەم خستبێتە بەردەست توێژەران بۆ ئەوەی بتوانن توێژینەوەیەکی تێروتەسەلی لەبارەوە ئەنجام بدەن.

١٩٢٣

یەکەم پەخشی ڕادیۆ بە زمانی کوردی لە ناوچەی خودموختاری کورد، لە چوارچێوەی سنووری (کوردستانی سوور)، لە قەفقاس، واتە لە یەکەتیی سۆڤیەت کە لینین ئەو ناوچە ئۆتۆنۆمییەی کوردستانی سووری دروست

کردبوو و تا سەردەمی ستالین "ساڵی ١٩٢٩" بەردەوام بوو. ستالین کاتێ هات (کۆماری سووری کوردستان) و ڕادیۆ کوردییەکەیشی نەهێشت.

١٩٢٧

یەکەم ئێزگەی ڕادیۆی تورکی لە تورکیا، بێگومان بە زمانی تورکی، لە ساڵی ١٩٢٧ بەملاوە دەستی بە پەخش کرد، تەنانەت وشەیەکیش بە زمانی کوردی (تەنانەت لە دەرەوەی ڕادیۆش) قەدەغە بوو. (بەم پێیە گەلی کورد، پێش گەلی تورک ڕادیۆیان هەبووە و پێش گەلی تورک بەزمانی خۆیان لەسەر ڕادیۆ قسەیان کردووە!).

١٩٣٢

خاوەنی قاوەخانەیەک، یەکەم ڕادیۆی هێنایە سلێمانی.



کوردەکانی "کوردستانی سوور"

١٩٣٤

یەکەم ڕادیۆ گەیشتە ناو ئێران.

١٩٣٦

- لە ١٩٣٦/٧/١ ڕادیۆی بەغدا (تەنیا بە زمانی عەرەبی) لە شاری بەغدا دادەمەزرێت و بۆ یەکەم جار بێژەرێک، عەبدولستار فەوزی، مامۆستای زمانی ئینگلیزی بوو، گوتی (هنا محطة الاذاعة اللاسلكية للحكومة العراقية في بغداد).

١٩٣٩

لە ١٩ی تشرینی دووەمی ١٩٣٩ لە بەغدا بەشی کوردی لە ڕادیۆی بەغدا دادەمەزرێت کە لە سەرەتادا تەنیا بۆ ماوەی (١٥) دەقیقە بوو، تێیدا هەواڵ و یەک دوو قەوانی کوردی پێشکێش دەکران. هەواڵی جەنگی جیهانیی دووەم و هەواڵی سیاسی دەخوێندرایەوە. بێژەرە کوردەکە ناوی (کامیل کاکەمین) بەئەسڵ خەڵکی سلێمانی بوو، کە پاشان کرایە بەڕێوەبەری ئێزگە کوردییەکە. هێندەی پێ نەچوو عەلی مەردان یەکەم قەوان و گۆرانی و مەقامەکانی خۆی لەو ئێزگەیەدا تۆمار کرد.

٢٢ی بانەمەڕی ١٩٤٠

یەکەم پەخشی ڕادیۆ بە زمانی فارسی لە پێناو بڵاوکردنەوەی سیاسەتی ڕەزا شای پەهلەوی دەستی پێ کرد. (بەم پێیە گەلی کورد، پێش گەلی فارس ڕادیۆیان هەبووە و پێش گەلی فارس، بەزمانی خۆیان قسەیان لە ڕێگەی ڕادیۆوە کردووە!).

١٩٤٠

زەمانی جەنگی دووەمی جیهانی، ئامێری ڕادیۆ لە کوردستانی عێراق پەیدا

بوو. له ٩ی شەو دەیگوت: هنا لندن هیئة الاذاعة البریطانیة. ئنجا هەواڵەکانی شەڕی نێوان هاوپەیمان دژی "دول المحور"، ئنجا عەبدولوەهاب و گوبانچی و ئەسمەهان و ئوم کەلسوم. هەندێکیش (بەرلین)یان دەکردەوە دەیگوت: «هنا برلین»، منداڵ دەیانگوت: «لا اله الا الله/ ئینگلیز بشکێ ئینشاڵڵا».

کاتێ ڕادیۆ تازە پەیدا بووبوو پاترییەکەی لە خۆی گەورەتر، یوونس بەحری، بێژەر بوو.

١٩٤١/٣/٥

– حکوومەتی فەرەنسا لە بەیرووت ئێزگەیەکی ڕادیۆی بە زمانی کوردی لە بەیرووت بە ناوی ڕادیۆ لوڤانت (Levant اذاعة الشرق) دامەزراند بۆ ئەوەی سۆزی کورد بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، واتە لە پێناو پڕوپاگەندەکردن دژی هیتلەر. ڕادیۆکەش بەشێک بوو لە ڕادیۆی لبنان. لەو ئێزگەیەدا لە هەر هەفتەیەکدا تەنیا دووجار بە زمانی کوردی پەخش دەکرا: هەواڵ و گۆرانیی کوردی بوو. لە مانگی بانەمەڕی ١٩٤٦ ڕاوەستا.

– بەهەمان شێوە ئینگلیزەکانیش لە ١٩٤١ لە ڕادیۆی (محطة الشرق الادني للاذاعة العربیة) بۆ ماوەی دوو کاتژمێر دەنگوباس و وتار و گۆرانی و مۆسیقای بە زمانی کوردی پەخش دەکرد.

١٩٤٢/٨ – ١٩٤٥/٨

ڕادیۆی کوردی لە یافا (ئیسرائیل)

لە چلەکاندا عەبدوڵا گۆرانی شاعیر و ڕەفیق چالاکی هونەرمەند و ڕەمزی قەزازی نووسەر لە ڕادیۆی یافا لە ئیسرائیل (اذاعة الشرق الادنی من یافا) کاریان کردووە.

ڕەفیق چالاک لە ١٩٤٢ سکرتێری کۆمەڵەی هیوا بووە و مامۆستاش بووە لە گەڕەکی مەڵکەندیی سلێمانی، لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێ:

«لەو سەردەمەدا ئەڵمانیا تەنگی دنیای لە ئینگلیز هێنابووە یەک. ئینگلیز

لەو ڕۆژەدا ئیشی بە کورد هەبوو. ئینگلیز داوای پێنج کەسیان کرد کە بچن بۆ فەلەستین بۆ ئێزگەیەکی کوردی کە لە شاری یافا بۆ کورد دەکرێتەوە. ئەو سەردەمە حزبی هیوا گەورەترین گرووپ لە کوردستاندا، لە ئەندامانی ئەم حزبە چوار کەس دەسنیشان کران: نووری شاوەیس، ئەنوەری مەلا حەمە ئاغا، ئیبراهیم کوردی و ڕەفیق چالاک. ئنجا لەبەرئەوەی ئەو سێیانە بەر لە من چووبوونە ناو سیاسەتەوە و لەلای میری ناسراو بوون، بەم بۆنەیەوە سەفەریان لێ قەدەغە کرا، لە جێی ئەوان عەبدوڵا گۆران و ڕەمزی قەزاز و من دەسنیشان کراین و بەرەو بەغدا کەوتینە ڕێ، ئنجا بەرەو فەلەستین کەوتینە ڕێ. لە یافا ستۆدیۆمان بۆ دامەزرا، جێ و ڕێمان بۆ دیاری کرا، ناوی ئێستگەکەمان نا «کوردستان». لە ماوەی ئەو سێ ساڵەدا لە ئۆگستسی ١٩٤٢ تا ئۆگستسی ١٩٤٥ سوودێکی باشم وەرگرت بەتایبەتی لە ڕووی هونەرییەوە چەندان مۆسیقاژەن و گۆرانیبێژی ناسراو بوونە هاوڕێم لەوانە محەمەد عەبدولکەریم، ئەمیری بزق، کە بە ڕەچەڵەک دەچووەوە سەر کوردانی دیاربەکر. هەر لەو سەردەمەدا خۆم خەریک کرد بەفێربوونی مۆسیقاوە بە نۆتە، ئالەتێکی ماندۆلینم کڕی و مامۆستایەکی یۆنانیم ڕاگرت.. سوودێکی باشم وەرگرت لە ئیخراج و تەمسیل و ئیلقا و دیکۆر و مکیاج و... هتد. تا لە ئۆگستسی ١٩٤٥ ئیستیقالەم کرد و لە ڕێی ئوردنەوە گەیشتمەوە بەغدا. هەر لەو مانگەدا بوو یان لە مانگی ئەیلوولدا لە ئێزگەی کوردی بۆ یەکەم جار دامەزرام و فووم پیا کرد: ئێرە ئێستگەی کوردستانی عێراقە، کە لە دوای سێ ڕۆژ لێیان قەدەغە کردم. هەرچی ئاوازێک کە لە یافا بە مۆسیقاژەنەکانی هاوڕێم نۆتم کردبوون بە مارشی فەرمیی کوردیشەوە، دامە برامان جەمیل بەشیر ئەویش خوا سەلامەتی بکا نازانم چیی لێ کردن».

١٩٤٣

یەکێک لە قاوەخانەکانی سنە ڕادیۆیەکی کڕی و لە قاوەخانەکەی خۆیدا داینا.

١٩٤٥

– یەکەم پەخشی ڕادیۆ بە زمانی کوردی بەدەستی خودی کورد کە دژ بە سیاسەتی ڕەزا شای پەهلەوی ڕاپەڕیبوون، لە تەورێز دەستی پێ کرد.

– پەخشی بەرنامە ڕۆژانەییەکەی ڕادیۆی بەغدا لە ١٥ خولەکەوە بۆ یەک کاتژمێر بە زمانی کوردی درێژ کرایەوە.



گۆران و ڕەفیق چالاک

١٩٤٦

– پەخشی ڕادیۆ بە زمانی کوردی لە یەریڤان واتە لە ئەرمەنستانی یەکەتیی سۆڤیەت دەستی پێ کرد، ڕۆژێ نیو کاتژمێر، هەواڵ و مۆسیقا و گۆرانی بوو. بەرنامەیەکی هاوشێوە بە زمانی کوردی لە شاری تفلیس لە گورجستانیش دەستی پێ کرد.

– دووەم پەخشی ڕادیۆ بە زمانی کوردی لە ئێران بەدەستی خودی کورد، کە دژ بە سیاسەتی ڕەزا شای پەهلەوی ڕاپەڕیبوون، لە شاری مەهاباد دەستی پێ کرد. ئەمەش لە سا و سێبەری کۆماری مەهاباددا کە ئێزگەیەکی ڕادیۆییی سەربەخۆیان دامەزراندبوو کە تا ٣٠ی بانەمەڕی ١٩٤٦ بەردەوام بوو. ڕۆژنامەی (کوردستان) ژمارە (٤٣) لە ڕۆژی ٤ی جۆزەردانی ١٩٤٦، نووسی: «ئێزگەی ڕادیۆ لە ڕێوڕەسمێکی تایبەتدا و بە بەشداریی کاربەدەستە پایە بەرزەکان و مێوانان کراوەتەوە». پێنج بڵندگۆیش لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی ناو شاردا داندرابوون بۆ ئەوەی هەموو خەڵک گوێیان لە وتارەکانی ڕادیۆ بێت. بەرنامەکان بریتی بوون لە: هەواڵ، گۆرانی، شرۆڤە، لێدوان...

١٩٤٧

– دوای تێکچوونی کۆماری مەهاباد، ڕادیۆی باکۆ لە ئازەربایجانی یەکەتیی سۆڤیەت بۆ ماوەی نیو کاتژمێر پەخشێکی تایبەتی هەبووە بە زمانی کوردی. هەندێک بۆچوون هەن کە دەڵێن ئەم پەخشە نیو کاتژمێرییە بە زمانی کوردی لە ڕادیۆی باکۆ، لەسەر داخوازیی مەلا مستەفای بارزان پەسەند کراوە.

– مەلا مستەفای بارزانی، کە لە دوای ڕووخانی کۆماری مەهابادەوە چووبووە باکۆ، لە ڕادیۆی باکۆی کۆماری ئازەربایجانی سۆڤیەتدا بە زمانی کوردی (بە دیالێکتی سۆرانی) ڕای گەیاند کە پێویست وایە کوردستان یەک بگرێت و کوردەکانی تورکیا و ئێران و عێراق هەموویان پێکەوە خەباتێکی یەکگرتووی کوردستانییان هەبێت و لە دەست ژێردەستەیی ڕزگار ببن و

دەوڵەتێکی کوردی پێک بهێنن (دەسنووسی ئەم پەیامە مێژووییە گرینگەی مەلا مستەفای بارزانی، کە لە ڕادیۆی باکۆوە بە دیالێکتی سۆرانی قسە دەکا، لە کتێبە بەنرخەکەی سەرۆکی هەرێم، کاک مەسعوود بارزانی، بڵاو کراوەتەوە).

ئەم ڕاگەیاندنەی مەلا مستەفا زەندەقی ڕەزا شای ئێران و هەندێک دەوڵەتانی ڕۆژئاوای برد، چونکە وایان لێک دایەوە کە ئەم ڕاگەیاندنەی مەلا مستەفا دەستی یەکەتیی سۆڤیەتی لە پشتەوەیە و یەکەتیی سۆڤیەت دەیەوێ دەوڵەتێک بۆ کورد دابمەزرێنێت (یەکێک لە ژمارەکانی نیویۆرک تایمز باسی ئەم دۆخەی کردووە). بۆیە ئەم ڕاگەیاندنەی مەلا مستەفای بارزان بووە هۆی ئەوەی کە ڕەزا شا لە ترسان بێت لە ساڵی ١٩٥١ نێردەرێکی یەک کیلۆ وایتی بۆ پەخشی ڕادیۆیی بە زمانی کوردی لە شاری سنە بۆ پڕوپاگەندە دژی ئەم بیرۆکەیە و لە پێناو سیاسەتی خۆی بۆ کوردەکان دابمەزرێنێت.

تا پووشپەڕی ١٩٥٠ هەندێک گەڵاڵە لە دەنگی ئەمەریکا Voa بۆ پەخشی بەرنامە بە کوردی لەلایەن باڵوێزخانەی ئەمەریکا لە بەغدا دارێژرا. پاشان ڕێککەوتننامەیەک لە نێوان دەنگی ئەمەریکا و ئێران لە پێناو پەخشی ڕادیۆ بەکوردی ئیمزا کرا. ئێران لە ساڵی ١٩٥١ نێردەرێکی یەک کیلۆ وایتیی لە سنە، نێردەرێکی تریشی لە ساڵی ١٩٥٥ تا ١٩٦٦ لە مەهاباد دامەزراند. بەرنامەکان بریتی بوون لە: هەواڵ، مۆسیقا و گۆرانی، شرۆڤە، شیعر، سەرگەرمی.. هتد.

– یەکەم بەرنامەی نهێنیی ڕادیۆیی، بە زمانی فارسی و ئازەری و کوردی، بەدەستی ڕێبەرایەتیی حزبی دیموکراتی ئازەربایجانی ئێران لە یەکەتیی سۆڤیەت دامەزرا.

١٩٤٩

پەخشی بەرنامە ڕۆژانەییەکەی ڕادیۆی بەغدا لە یەک کاتژمێرەوە بە زمانی کوردی زیاد کرا بۆ دوو کاتژمێر و چل و پێنج خولەک.

١٩٥٠

پەخشی بەرنامە ڕۆژانەییەکەی ڕادیۆی بەغدا هاوکاریی کرد لەگەڵ ڕادیۆی بەغدا بۆ بڵاوکردنەوەی کۆوارێکی ڕادیۆییی مانگانە بەناوی (هنا بغداد) بە زمانی عەرەبی و کوردی کە هەتا پووشپەڕی ١٩٥٨ بەردەوام بوو.

١٩٥٦

عێراق یەکەم دەوڵەتی عەرەبییە کە تەلەڤزیۆنی دەوڵەتی دامەزراندبێ – بە عەرەبی.

هاوینی ١٩٥٧ تا مانگی نیسانی ١٩٥٩

– ئێرە ئێزگەی دەنگی کوردییە لە قاهیرە!

دەوڵەتی میسر، لە زەمانی جەمال عەبدولناسر، لە ساڵی ١٩٥٧ لە پێناو هێرشکردنە سەر دەوڵەتی عێراق، هات کوردەکان و کێشەی کوردی بەکار هێنا: لە ڕادیۆی قاهیرەوە ماوەی ٤٥ خولەکی تەرخان کرد بە زمانی کوردی کە گوێگرێکی باشی لە عێراق و سووریا و ئێراندا هەبوو. ئەو پەخشە (٤٥) خولەکییە بریتی بوو لە هەواڵەکانی سیستەمی پاشایەتیی عێراق و پەیماننامەی بەغدا، لەگەڵ باسی ڕۆشنبیریی کورد و شیعری شاعیرانی کوردی نەتەوەباوەڕ. بەشێوەیەکی گشتی هانی کوردی دەدا بۆ ئەوەی بیر لە مەسەلەی ڕزگاریخوازیی نەتەوەییی خۆیان بکەنەوە لە ئێران و عێراق و تورکیادا.

لە چاوپێکەوتنێکدا کە لەگەڵ هەژاری شاعیردا کردوومە لە پاریس لە مانگی نۆڤەمبەری ١٩٨٩، هەژار دەیگوت:

«ئەو کاتەی لە بەغداوە چوومە قاهیرە بۆ ئەوەی لە قاهیرەوە بەرەو مۆسکۆ بڕۆم، کوردەکانی ئێزگەی کوردیی قاهیرە هەلیان بۆ ڕەخساندم کە وتار و شیعر لەوێ بخوێنمەوە. شیعرێکم بەناوی چەپکە گوڵێک لە ڕۆژی ١٩٥٨/٨/١٥ خوێندەوە کە بەسەر گەڕانەوەی مەلا مستەفای بارزانیدا هەڵمگوتبوو».

هەژار لەو چاوپێکەوتنەدا دەڵێ کە دەعوەتیان کردووەتە ئەو ئێزگەیە بۆ ئەوەی لەوێ هاوکارییان بکات، دەیگوت:

«ئەو کاتە کوردێک لەو ئێزگە کوردییەی قاهیرە کاری دەکرد ناوی شێخ عومەر وەیسی بوو، بادینی بوو، لەگەڵ هەندێ کوردی تری عێراقی کە یەکێکیان کەرکووکی بوو. چاوپێکەوتنێکیان لەگەڵم ساز دا کە تێیدا باسی دۆخی سیاسیی ئەمڕۆی کورد و ئەدەبیاتی کوردیم بۆ کردن، هەروەها شیعرێکم بۆیان خوێندەوە کە بەبۆنەی گەڕانەوەی بارزانیی نەمر نووسیبووم. شیعری سروودەکانی (ئەی ڕەقیب) و (ئەی کوردینە ئەی مەردینە)م پێ دان و لەوێ بەگۆرانی لێیان دایەوە. هەژار دەیگوت «ماوەیەکی کەم هاوکاریم کردن».

هۆشیار تاهیر بابان، کە یەکەم بێژەری ئێزگەی دەنگی کوردی- لە قاهیرە بووە، لە ژمارە (١٢٥٢)ی ڕۆژی ١٩٩٦/٤/٢ لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)دا دەڵێ کە:

بەشە کوردییەکەی ئەو ڕادیۆیە لە چوارچێوەی بەرنامە بیانییەکانی ناو ڕادیۆی قاهیرە داندرابوو، کۆمەڵێک خوێندکاری کورد (محەمەد حوسێن مەلا هەولێری، هۆشیار تاهیر بابان، محەمەد کەریم شەیدا، عەبدولحەمید ئیمام بادینانی، عەبدولا مەعرووف) کە لە قاهیرە خوێندوویانە هاوکارییان کردووە لە ئامادەکردنی بەرنامەکانی ئەو ئێزگەیە: هەر لە ناو ئەوانیشدا (دوای تاقیکردنەوە) سێ لەو خوێندکارانە (محەمەد حوسێن مەلا هەولێری و هۆشیار تاهیر بابان و محەمەد کەریم شەیدا) وەرگیراون ببن بەبێژەر.

دەنگوباس و ڕای ئێزگە و تەعلیقی سیاسی بە زمانی عەرەبی بۆیان دەچوو و ئەوانیش وەریان دەگێڕایە سەر کوردی، بەڵام لە سەرتاسەری بەرنامەکانی تری ڕۆشنبیری ئازاد بوون: برگەی ئەدەب و وێژە و گۆرانی و شیعر و مێژووی کورد و سروودی نیشتمانیی کوردی بەشێوەیەکی ئازاد پەخش دەکرا. قەدەغە بووە لە عێراقەوە کاسێتیان بگاتە دەست، بۆیە خوێندکارە کوردەکان هەر خۆیان (لەوانە: عادل حاجی ساڵح هەولێری و نووری کانەبی و فاتیح هەمەوەندی و سەفوەت بابان) سروود و گۆرانییان دەگوت و تۆماریان

دەکرد. تیپی هونەریی ئێزگەی قاهیرە تەکنیککار و یارمەتیدەر و هاوکاریان بوونە. سروودەکانی (پیرەمەگروون موقەدەسی، کوردستان جێگەی بەچکە شێرانە، تا دەست لە ملی هیوا نەکەین، ئەی ڕەقیب..) هەموویان لەوێ تۆمار کراون.

هۆشیار تاهیر بابان، یەکەم بێژەری ئەو ئێزگەیە، لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێدا دەڵێ: «خەڵکی کوردستان لە عێراقەوە بەردەوام نامەیان بۆمان دەنارد.. تەنانەت لە کوردستانی سووریاشەوە. ئەمە جگە لەوەی کە ڕۆشنبیرانی کوردی ئەوروپاش زۆر هاوکارییان دەکردین».

ئەم ئێزگەیە لە مانگی نیسانی ١٩٥٩ داخرا.

دەوڵەتی ئێران بەم ڕادیۆ کوردییە زۆر قەڵس بووبوو، ڕۆژنامەی (اطلاعات) ئەم ڕادیۆیەی بە پلانی هاوبەشی میسر و یەکەتیی سۆڤیەت دژی ئێران ناوزەد دەکرد.

مەلا غەفووری حافزی مەهابادی لە دیوانە شیعرەکەی خۆی (دیاریی مەهاباد)، چاپەمەنیی سەیدیان، فەروەردینی ٦٣ (١٩٨٤)، لە لاپەڕە (١٣) بەم شێوەیە باسی لەم ئێزگە کوردییە کردووە: «لە ساڵی ١٩٥٦ – ١٩٥٧ ئێزگەی



کوردی لە قاهیرە دەستبەکار بوو، ڕۆژانە نیو سەعات بەرنامەی بڵاو دەکردەوە. زۆر هۆگری ئەو بەرنامەیە بووم و هەموو جارێ بە بیستنی ئەو بەرنامەیە هەست و مێشکم دەبووژایەوە. لە ساڵی ١٩٥٨ کە شۆڕشی ١٤ی تەمووزی عێراق دەستی پێ کرد، بەتەواوی هەستی من لەبارەی شیعرەوە گۆڕا بەهۆی ئەو بەرنامەیەوە.

کوردناسی ناوداری فەرەنسی، تۆما بوا Thomas Bois، هێندەی من ئاگام لێ بێ، لە هەموو توێژەرێک زیاتر لەبارەی ئەم ڕادیۆ کوردییەی قاهیرە قسەی کردووە، ئەمەش لە ژمارە (٤٤)ی کۆواری L Afrique et l Asie, Bulletin des ancien C.H.E.A.M.، لە ڕاپۆرتی ژمارە (٣)ی مانگی سێپتەمبەری ١٩٥٨ کە لە پاریس دەردەچوو.

تۆما بوا ڕاپۆرتێکی گەرماوگەرمی لە هەمان مانگ و ساڵی پەخشی ڕادیۆکە بۆ کۆوارەکە ناردووە و دەڵێ کە ڕادیۆکە لە مانگی شەش و حەوتی ساڵی ١٩٥٨دا پەخشی بەردەوام زۆر کاریگەر بووە؛ ئێران و عێراق و تورکیا نارەزاییەکی توندیان بەرامبەر ئەو ڕادیۆ کوردییەی قاهیرە دەربڕیوە و بە پیلانێکی کۆماری یەکگرتووی عەرەبی (سووریا و میسر)ی دەزانن کە هاوپەیمانەکەشیان یەکەتیی سۆڤیەتە دژی ئێران و عێراق و تورکیا؛ ئەمەش لەوانەیە پێوەندییە دیپلۆماسییەکانی نێوانیان تێک بدا.

تۆما بوا ئاماژەی بۆ چەندان ڕۆژنامەی ئێرانیی ئەو هەفتەیە کردووە، لەوانە (طهران مصور) کە لە ١٩٥٨/٧/٤ باسی مەترسییەکانی ئەم ڕادیۆ کوردییەی قاهیرەی کردووە. تۆما بوا دەڵێ کە هەواڵەکانی عێراقیش ئەو ڕادەگەیەنن گوایا کوردی کەرکووکیش لە ١٩٥٨/٧/١١ نارەزاییی خۆیان دەربڕیوە بەرامبەر ئەو ڕادیۆیە و بەرامبەر بە کۆمۆنیزم و شیوعییەت کە لە پشتەوەی ئەم ئێزگە کوردییەن. حکوومەتی عێراق شپرزە بووە و دەترسێ گەلی کورد لە ئاکامدا – بەهۆی ئەم ڕادیۆیەوە – ببنە داردەستی ناسرییەکان (جەمال عەبدولناسر) لە میسر و شیوعییە سۆڤیەتییەکان کە بەهۆی ئەم ئێستگەیەوە کوردان دەورووژێنن.

.U.P.iی لەندەن و کـــــۆواری نوێی لۆزان Nouvelle Revue de Lausane لە ١٩٥٨/٧/١٢ مانشێتێکیان نووسیوە تێیدا دەڵێن: (خەریکە ڕاپەڕینێکی کوردان دژی ئێران و عێراق سەرهەڵدەدا)؛ هەروەها ئەوەش باس دەکەن کە دەوڵەتی عێراق و ئێران لە ١٩٥٨/٧/١١ بەملاوە ئیحتیاتی خۆیان تەواو وەرگرتووە نەوەک ڕاپەڕینێکی لە ناکاوی کورد لە عێراق و لە ئێراندا بەهۆی ئەم ڕادیۆ کوردییەی قاهیرەوە، کە هەبێ و نەبێ دەستی دەرەکیی تریشی تێدایە، بکەوێتە سەرپێ. تۆما بوا لە درێژەی ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێ هەر بۆیەش لە ١٩٥٨/٦/٢ بەملاوە سەرۆک وەزیرانی دەوڵەتی ئێران چەند بەرنامەیەکی ڕادیۆیی لە ناو ئێراندا هەر بە زمانی کوردی ساز کردووە و بە زمانی کوردی کوردەکانی خۆی «لەم پلانە گڵاوانەی بێگانەکان» ئاگەدار کردووەتەوە.

لەلایەکی تریشەوە، تۆما بوا دەڵێ، حکوومەتی تورکیا زۆر لەوە دەترسێ کە پلانێکی تازە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی هاتبێتەوە ئارا. (Ralph Izzard لە ڕۆژنامەیەکی تورکیدا بەناوی Daily Mail لە ١٩٥٨/٧/٢١ لە ئەستەمبوڵ ئەمەی نووسیوە). ئەمەش چونکە، تورکیا وا تێ دەگات کە حکوومەتی نوێی عێراق (عەبدولکەریم قاسم کە دایکی کوردە!) هیچ دوور نییە پێشوازییەکی گەرم لە پلانی سیاسیی یەکەتیی سۆڤیەت بکات بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی؛ لەو کاتەشدا یەکەتیی سۆڤیەت دەتوانێ زۆر بەئاسانی دەستی خۆی بگەیەنێتە عێراق و پاشان بگاتە کەنداوی عەرەبیش کە لە دەمێکەوە خەونی پێوە دەبینێ.

تۆما بوا هەواڵ و ڕاپۆرتەکانی ناو چەندان ڕۆژنامە و کۆواری تریش بە زمانی ئینگلیزی و تورکی و فارسی و عەرەبی و ڕووسی، کە بەم ڕادیۆ کوردییەی قاهیرەوە خۆیان سەرقاڵ و مشەوەش کردووە، دەخاتە بەرچاو و شیتەڵیان دەکاتەوە. لە کۆتاییشدا ئەم مەسەلەیە گرێ دەداتەوە بە گەڕانەوەی مەلا مستەفای بارزانی کە تازە لە یەکەتیی سۆڤیەتەدا گەڕاوەتەوە کوردستان!

١٩٥٨

له ئەنجامی مەترسییەکانی ئەو دۆخە سیاسییەی کە تازە هاتبووە پێشەوە لە بەرژەوەندیی کورددا، لە ناو عێراقیش، پەخشی بەرنامە ڕۆژانەییەکەی بەشی کوردیی ڕادیۆی بەغدا – بە زمانی کوردی، لە ١٩٥٨ بەملاوە، پەرەی سەند و بەرنامەی پەروەردەیی و کەمێک ڕۆشنبیریشی تێ کەوت؛ بووە ڕادیۆیەکی سیاسیی بەهێز و کاری لە پارچەکانی تری کوردستانیش کرد.

١٩٦٠

ڕۆژنامەی ژین، ژمارە (١٥٤١) لە ڕۆژی ٤ی گەلاوێژی ١٩٦٠ و پاشان لە ڕۆژی ١٨ی خەرمانانی ١٩٦٠، ڕەخنە لە ڕادیۆی بەغدا دەگرێت و داوا دەکا کە ڕادیۆی بەشە کوردییەکە پێویستە پەرەی پێ بدرێت. لە دوای ئەویش ڕۆژنامەی (خەبات) بەهەمان شێوە.

٢٣ی بانەمەڕی ١٩٦١

ئێزگەی (رادیو پیک ایران) کە ڕادیۆی حزبی توودەی ئێران لە ئەورووپا بوو، پەخشی بەرنامەی بە زمانی کوردی، بۆ ماوەی نیو کاتژمێر، زیاد کردە سەر پەخشە فارسی و ئازەرییەکەی خۆی. تا ساڵی ١٩٧٦ هەر بەردەوام بوو.

پایزی ١٩٦٣

شۆڕشی کورد لە پێناو ئۆتۆنۆمی لە کوردستانی عێراقدا بە سەرکردایەتیی بارزانیی نەمر، لە پایزی ١٩٦٣بەملاوە، ئێزگەیەکی ڕادیۆیی، بەناوی (دەنگی کوردستان) لە ناو شاخەکانی کوردستاندا (لە ماوەت، لە گوندی عیسایێ، لەسەر گردێک کە پێیان دەگوت «گردە ڕەش») دامەزراند کە بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو کاریگەریی هەبوو، ئەگەرچی لە سەرەتادا تەنیا بۆ ماوەی یەک کاتژمێر بوو. هەندێ لەو ڕووناکبیر و هونەرمەندانەی لەو ئێزگەیەدا کاریان دەکرد: شەهید سامی عەبدوڕەحمان، ئەحمەد دەنگ گەورە، عومەر دزەیی، فەرهاد عەونی.. هتد.

ئێزگەی دەنگی کوردستانی عێراق لە ساڵی ١٩٦٨ بەملاوە، جگە لە عەرەبی و ئینگلیزییەکەی، بەرنامەی بە زمانی ئاسووری و تورکمانیش بڵاو کردەوە. ئێزگە لە ڕێککەوتننامەکەی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ بەملاوە ڕاوەستێندرا، بەڵام لە ١٩٧٤/٣/٢٨ لەسەر شەش شەپۆل کەوتەوە کار کە لە بەیرووت و قوبرسیش دەبیسترا. دوای نسکۆی ١٩٧٥ ڕادیۆش ڕاوەستا. دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٧٦ بەملاوە سەرلەنوێ دەستی بە پەخش کردەوە.

١٩٦٧: تەلەڤزیۆنی کەرکووک دامەزرا، تەنیا بە زمانی عەرەبی.

١٩٦٨

ئامانجی ڕادیۆی بەغدا بریتی بوو لە چەواشەکردنی خەڵکی کورد و هاندانیان دژی شۆڕشی یاخیبووە کوردەکان "المتمردين الاكراد"، بۆیە پەخشی ڕادیۆ بەکوردی لە ڕادیۆی بەغدا زیادی کرد و پڕوپاگەندەی بەعس دزەی کردە ناو هەموو بەرنامەکان.

١٩٦٩

پەخشی کوردی لە تەلەڤزیۆنی کەرکووک بۆ ماوەی یەک کاتژمێر کرایەوە.



یەکێک لە یەکەم کادیرەکانی رادیۆی کوردی، رەفیق چالاک

١٩٧٠

لە کوردستانی ئێران، ڕادیۆی کرمانشان بە زمانی کوردی، کاریگەرییەکی باشی بەسەر پارچەکانی تری کوردستانەوە هەبوو.

١٩٧٢

پەخشی کوردی لە تەلەڤزیۆنی کەرکووک زیاد کرا بۆ شەش کاتژمێر لە شەوێکدا.

١٩٧٣

لە کاتێکدا کە ئێران یارمەتیی سەربازیی بۆ شۆڕشی کوردی کوردستانی عێراق دابین دەکرد، دەوڵەتی عێراقیش لە دژی ئەوان (ڕادیۆی دەنگی کوردستانی ئێران)ی لە ساڵی ١٩٧٣ دامەزراند کە تا ١٩٧٥ بەردەوام بوو، چونکە لە ١٩٧٥ بەملاوە چی تر کاریان پێ نەما.

١٩٧٤

پەخشی بەرنامە ڕۆژانەییەکەی ڕادیۆی بەغدا بە زمانی کوردی زیاد کرا بۆ ١٧ کاتژمێر و بیست و پێنج خولەک لە ڕۆژێکدا، ئەمەش لە پێناو چەواشەکردنی خەڵکی کورد و هاندانیان دژی مەلا مستەفای بارزانی، بەقەولی بەعسییەکان دژی یاخیبووە کوردەکان "المتمردين الاكراد".

سەرچاوە:

Thomas Bois: Cronique N. 3., in (L Afrique et l Asie, Bulletin des ancien C.H.E.A.M.), Septembre 1958, Paris.

– فیلیپ کرینبۆرک: کولتوور و ناسنامەی کورد، بەتایبەتی وتارەکەی «د. ئەمیری حەسەنپوور»، و: وریا ڕەحمانی، موکریانی، هەولێر: ٢٠٠٨.

– باکووری: ئێزگە، چاپخانەی شەهاب، هەولێر: ٢٠٠٩

– مەلا غەفووری حافزی مهابادی: دیوانە شیعرەکەی خۆی (دیاریی مەهاباد)،

چاپەمەنیی سەیدیان، فەروەردینی ٦٣ (١٩٨٤)، لاپەڕە (١٣).
- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ هەژار موکریانی لە پاریس لە مانگی نۆڤەمبەری ١٩٨٩، هەروەها لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد لە لەندەن لە ١٩٩٠.
- نامەیەکی ڕەحیمی قازی کە لە ١٩٩١ لە باکۆوە بۆی ناردووم.
- مستەفا ساڵح کەریم چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئازاد ڕەفیق چالاک لە ژمارە (١٢٧٠)ی کوردستانی نوێ: ١٩٩٦/٤/٢٣.
- ئازاد ڕەفیق چالاک، لە ژمارە (١٧٦ و ١٧٨)ی ڕۆژنامەی (الاتحاد) لە مانگی ئابی ١٩٩٣.
- وریا جاف: وتارێک لە (برایەتی)، ژمارە ٢١٦٧، چوارشەم: ١٩٩٦/٥/٨.
- تەلەفۆنێکی بەڕێز (فەرهاد عەونی) لەبارەی (ئێزگەی دەنگی کوردستان).

# دێرێک لەبارەی مێژووی مۆسیقا لە ئەوروپا

قووڵترین گەوهەری جیهان
واتە هەبوون و خودی ئەسڵی دنیا، لە
ڕاستەوخۆترین جیلوەکانی خۆیدا
بریتییە لە ئیرادە.
شۆپنهاوەر



لە سەرهەڵدانی مەسیحیەتەوە، بەدرێژاییی سەدەکانی ناوەڕاست، مۆسیقا بەشێکی مەراسیمەکانی کڵێسا بوو: پاشکۆی وشەکانی ناو ئینجیل و جووڵانەوەکانی مەراسیمی کڵێسایی بوو.

ئاوازە کاتۆلیکییەکان، کە کۆڵەگەی مۆسیقای دینی بوون، لە ماوەی سەدەکانی چوارەم تا نۆیەمدا، لەوپەڕی گەشانەوەی خۆیاندا بوون. تیۆرداڕێژەکانی کڵێسا گەلێک نۆتە و ئاوازی کڵێساییان بۆ کڵێسا کردبوو بە شتێکی ستاندارد. هەموو ئەو ئاواز و نۆتە مۆسیقاییيانەش لە یۆنانییە دێرینەکانەوە هاتبوون، هەر بۆیە زاراوەکانیش زاراوەی گریک بوون.

مۆسیقای دینیی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئاوازە کاتۆلیکەکانەوە وەرگیرابوون. تەنانەت ماوەیەک خەڵک باوەڕی وابوو کە ئاوازی زەنگدانەوەی زەنگی کەنیسە ڕۆحی خراپ دەرەوێنێتەوە.

لە مۆسیقای دینییەوە، واتە لە موزیکی کڵێساییەوە دوو پێشکەوتن ڕۆڵیان لە بەستێنی پێشکەوتنی هونەری مۆسیقادا هەبوو:

١- سەرهەڵدانی ڕێنووسی مۆسیقایی کە لە ناو ڕاهیبەکانی سەدەکانی یازدەم و دوازدەمدا هاتە کایەوە. (یەکەمین پارچە مۆسیقای چاپکراو لە ساڵی «١٥٠٠» لە شاری ڤینیز لە ئیتاڵیا چاپ کرا، بەڵام تا کۆتاییی سەدەی هەژدەم مۆسیقارێ نەیدەتوانی لەسەر خەرجیی خۆی بەرهەمە مۆسیقاییيەکانی خۆی چاپ بکات).

سەرهەڵدانی ڕێنووسی مۆسیقایی لە سەدەکانی یازدەم و دوازدەمدا وای کرد تێکستی مۆسیقایی بپارێزرێت و پۆلێن بکرێت و کەم و زیاد بکرێت و پەرەی پێ بدرێ.

٢- کڵێسا بایەخی دەدایە گەشەکردنی مۆسیقا بۆ ئەوەی دین بەباشی بڵاو بکاتەوە و شکۆمەندیی دین و مەسیح و کڵێسا بۆ خەڵک پێشان بدا، بۆیە کڵێسا دەهات گەلێک خەڵکی هەژاری لەسەر جادەکان هەڵدەگرتەوە و فێری مۆسیقای دەکردن بۆ ئەوەی ببنە گۆیندە و گۆرانیبێژ و «سەلاکێش»

و مۆسیقاژەنی کڵێسا. ئەمەش گەیشتە ئەوەی کە لە ناو کەنیسەکانی ئەوروپادا، مۆسیقای تیۆری، وەک قانوون و فەلسەفە و زانست، ببێتە زانستێکی لاهووتی و بخوێندرێ.

تا سەدەکانی پێش ڕێنسانس (سەدەکانی ١٥ و ١٦)، زیاتر و بەپلەی یەکەم مۆسیقای دینی باو بوو، مۆسیقای میللی بەچاوی سووک تەماشای دەکرا. (وەک لای خۆمان کە گۆرانیبێژی میللی تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەمیش پێی دەگوترا: چاوەش، شایەر).

گۆرانیبێژە ترۆبادۆرەکان لە باشووری فەرەنسا هەر لە سەدەکانی یازدە و دوازدەوە دەرکەوتبوون. نووسەرێکی فەرەنسی، یۆهانس دی گرووشۆ، لە ساڵی ١٣٠٠ بۆ یەکەم جار جەسارەتی کرد، لە پاڵ مۆسیقای کەنیسەیی، باس لە مۆسیقای عەوام پەسندی خەڵک بکا، واتە باس لە گۆرانیی میللیی غەیری کەنیسەیی.

هەم دەوڵەت و هەم کەنیسە دژایەتیی ئەم جۆرە گۆرانیبێژە گەڕۆک و ئەم مۆسیقا میللییانەیان دەکرد. پۆل هنری لانگ لە کتێبی (Our Musical Her- : Curt Saches tiage, N.Y. 1984) دەڵێ: « لە سەدەی سێزدەم ئەم گۆرانیبێژە میللی و مۆسیقاژەنە گەڕیدانە لای خەڵک خۆشەویست بووبوون، ڕۆڵی شانۆ و تەلاری مۆسیقایان لە ناو خەڵکدا دەبینی. تا سەدەی چواردەمیش، گۆرانیبێژە میللی و مۆسیقاژەنە گەڕیدەکان، سەبارەت بەوەی کە ئازادی و هێزێکی زیاتریان پەیدا کردبوو، دەوڵەت ڕێگەی لێ دەگرتن و دژایەتیی دەکردن: چونکە دەیانتوانی بانگەواز بۆ ڕاپەڕینێکی کۆمەڵایەتی یان سیاسی بکەن».

لە ساڵی ١٣٢٥ پاپا، یۆهانسی دوازدەم، بەدەرکردنی فەرمانێکی دینی «ئەم ڕەوتە تازەیەی مۆسیقای» قەدەغە کرد؛ چونکە، پاپا یۆهانسی دوازدەم دەیگوت: «لە جیاتی چڕینی میلۆدییە کۆن و باوەکان دێن میلۆدیی تازە و داهێنراو دەخوێننەوە. میلۆدیی توند و خێرا ئیزافە دەکەنە سەر ئاوازەکانی کتێبی پیرۆز. هەموو ڕازاندنەوە و شتەکانی تریشیان وا دەکا کە گوێگر لە ڕێی ئیمان لابدا».

هەروەها لە ساڵی ١٤٠٢ ئەنجوومەنی عەوامی ئینگلتەرا بڕیارێکی دەرکرد کە «پێویستە چی تر ڕێگە نەدرێتە هیچ گۆرانیبێژی بەرەڵا و مۆسیقاژەنێکی سەر شەقامەکانی وێڵز؛ کە کردوویانەتە خو و شانۆنامە و کلوونبازی بۆ خەڵک پێشکێش دەکەن. ئەمەش چونکە هەر ئەمانەن لە پاڵ درۆزن و جادووگەر و غەیبگۆکان بوونەتە مایەی ئاژاوە بۆ خەڵکی وێڵز».

سەرەڕای هەموو ئەم قەدەغەکردن و سانسۆرانە، وردە وردە مۆسیقا دەیویست ئۆتۆنۆمیی خۆی وەربگرێت و لە کڵێسا جودا ببێتەوە. ڕەوتی میللی، هێدی هێدی، بەرەو مۆسیقایەکی نامەزهەبی و ناکڵێسایی هەنگاوی دەنا. ئاهەنگسازی هۆڵەندی، ئۆرلاندۆ دی لاسۆ (١٥٣٢– ١٥٩٤)، هەروەها ئاهەنگسازی فلاندەری، ئیسحاق (١٤٥٠– ١٥١٧) کەرنەڤاڵی وایان ساز دەدا کە لە ناو خەڵک و لەسەر جادەکاندا پێشکێش بکرێن.

جاریێ هەموو ئەم لە ڕێ لادانە سەرەتاییانە، ئەگەرچی نامەزهەبی و ناکڵێسایی بوون، بەڵام سادە و لیریک بوون.

لە کۆتاییی سەدەکانی ناوەڕاستدا کڵێسا گەیشتبووە ئەو قەناعەتەی کە گۆرانی و مۆسیقا پێویستە دەربڕی تەنیا ئەو دنیا و بەهەشت بێت؛ نابێ باس لە برسییەتی و دەنگەدەنگەکانی ئەم دنیایەی ئەمڕۆ بکات. پیاوانی کڵێسا دەیانگوت ئەم جۆرە مۆسیقا و گۆرانییە دنیاییانە «دەستی شەیتان»ی تێدایە.

لە کۆتاییدا خودی ڕاهیبەکان خۆیان ئەو دەستە شەیتانییەیان خستە ناو مۆسیقای کڵێساییەوە: ئاوازە ئەویندارییەکانیان هێنا لە ناو ئاوازە دینییەکاندا گونجاندنیان. ئەمەش بەو ئامانجە کرا کە مەراسیمە دینییەکان شێوە و ڕەهەندێکی مرۆڤایەتییانە بەخۆوە بگرن.

لە ١٥١٧ تا ١٥٨٦ هەوڵدانەکانی مارتین لووتەر Luther (١٤٨٣– ١٥٤٦) و جۆن فۆکس و کالڤان بۆ ریفۆرم لە ناو دەوڵەت و کۆمەڵگەی ئەورووپیدا دژی دەسەڵات و کەنیسە لە پێناو ئازادکردنی مرۆڤ و گەیشتن بە مافەکانی (کە مەزهەبی پرۆتێستانتی لێ کەوتەوە) ئەم ڕەوتەیان بەهێزتر کرد.

ڕاستییەکەیشی، مۆسیقای پرۆتێستانتی، دوای یاخیبوونەکەی مارتین لووتەر و ریفۆرم، بووە هۆی گەشەسەندنی ئەم جۆرە مۆسیقا و گۆرانییە میللییەی کە دەیویست مۆسیقا لە ناو خەڵکدا و لە دەرەوەی کلێسا سەربەخۆیی خۆی هەبێ. مارتین لووتەر خۆیشی چەند سروودێکی دارشتبوو کە بەهرەی لەو گۆرانییە میللییانەی خەڵکەوە وەرگرتبوو، هەندێکیشیان سروودی چینی جووتیاران بوون کە لە ساڵی ١٥٢٥ دژی دەوڵەت ڕاپەڕیبوون.

ئەم سروودە پێکەوەیی و میللییانە پێیان دەگوترا کۆراڵ Chorale ئەگەرچی دەقاودەق لیریک نەبوون و لە سەرچاوەیەکی دینیشەوە هاتبوون (ئەو سروودە ئینجیلی و دینییانە بوون کە لە کلێساکانی ئەڵمانیا دەگوترانەوە) یادگاری ئەو سەردەمە بوون کە خەڵکی ئەڵمانیا دژی ئەو کۆت و پێوەندانە ڕاچەنیبوون کە دەرەبەگەکانی ئەڵمان خستبوونیە ملیان. مارتن لووتەر گەشەی بە کۆراڵ دا: کۆراڵی مەزهەبیی بەگۆرانییە میللییە ئەڵمانییەکان موتەربە کرد.

وای لێ هات لە سەدەی ڕێنسانسدا تەنیا مۆسیقارەکان بایەخیان نەدەدایە مۆزیک، بەڵکو فەیلەسووفەکانیش کەوتنە سەر ئەوەی باس بە بایەخی چۆنیەتیی دەربڕینی فیکر بکەن لە ڕێگەی موزیکەوە. فەیلەسووفی فەرەنسی، دیکارت لە تەمەنی بیست ساڵیدا، واتە لە ساڵی ١٦١٨ کتێبی (ئەلفابێی مۆسیقا)ی بڵاو کردەوە.

بەدرێژاییی سەدەی شازدەم و لە سەرەتای سەدەی حەڤدەمدا، چەند ئاهەنگسازێک لە ئیتاڵیا و ئینگلستان چەند هەنگاوێکی تریان نا لە ڕاستەشەقامی دەوڵەمەندکردنی مۆسیقای غەیرە کلێسایی. ئەمەش بە سازدانی مۆسیقا و گۆرانی، بەشێوەیەک کە بشێت لە ماڵەوە و لە مەجلیسەکاندا گوێیان لێ ڕابگریت. جگە لەمەش هەوڵی ئەو مۆسیقارانە بەشێوەیەک بوو کە ئاوازەکان هەر دووبارە و دووبارە نەکرێنەوە وەک لە ئاوازە کلێساییەکاندا هەبوو بەڵکو کارێک بوو لەسەر بنچینەی تۆنالیتی: سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتاییی هەبوو.

## سەرهەڵدانی ئۆپێرا

## یاخیبوون دژی دەسەڵاتی کڵێسا

هەوڵدان بۆ بەدنیاییکردنی هونەری مۆسیقا لە سەردەمی ڕێنسانس بەملاوە، بووە هۆی ئەوەی دراما بێتە ناو مۆسیقاوە، واتە گەیشتە ئەوەی کە ئۆپێرا (ئەو درامایەی کە لەگەڵ مۆسیقا پێکەوە خۆیان بەیان دەکەن) لە کۆتاییی سەدەی شازدەم و لە سەرەتای سەدەی حەڤدەمدا بۆ یەکەمین جار لە شاری فلۆرەنسا و ڤینیز لە ئیتاڵیا سەری هەڵدا.

ئۆپێرا یادگاری درامای کلاسیکیی یۆنانە کە دەیانگوت «شیعری درامی پێویستە بە دەنگ و ئاوازێکی زۆر بەرز بخوێندرێت». لە سەدەی حەڤدەمدا وای لێ هات حەڤدە ئۆپێراخانە لە ڤینیز کرانەوە.

ئۆپێرا ئەگەرچی لە دەرەوەی کڵێسا و بۆ هەموو خەڵک پێشان دەدرا و لە مەراسیمەکانی کڵێسا جودا بووبووە، بەڵام وەک ژانرێکی «شۆڕشگێڕانە» و ڕیالیست لەدایک نەبوو: تەنیا جیهانی ڕابردووی جارانی بەیان دەکرد، نەک گیروگرفتەکانی ژیانی سەردەم. تەنیا نەجیبزادە و خواوەندە ئەفسانەییەکان دەبوونە قارەمانی ناو ئۆپێرا، هەندێ جاریش فریشتەکان.

کلۆدیۆ مۆنتێ ڤێردی (١٥٦٧– ١٦٤٣) یەکێک لە ناودارترین و داهێنترین ئۆپێراسازەکانی ئەوروپای سەردەمی خۆی بوو. دوای ئەمیش جۆرج فرێدریک هاندل (١٦٨٥– ١٧٥٩). ئنجا لە کۆتاییی سەدەی هەژدەم، مریستۆف ویلیبالدفۆن (١٧١٤– ١٧٨٧) لە مانیفێستێکدا ڕای گەیاند کە لە هونەری ئۆپێرادا «مۆسیقا دوای شیعر بەپلەی دووەم دێ».

ئۆپێرای کۆمیدی لە سەدەکانی حەڤدەم و هەژدەمدا، وەک تەواوکەرێک بۆ ئۆپێرای جیدی (تراجیدی) سەری هەڵدا. ئۆپێرای کۆمیدی وەک شیرێکی دوو دەم وابوو: بواری دایە دەسەڵات تا بە چینی خوارەوەی کۆمەڵ پێ بکەنن و قەشمەرییان پێ بکەن، لەلایەکی تریشەوە چینی خوارەوەی کۆمەڵیش دەرفەتی ئەوەی پەیدا کرد بتوانێ ڕەخنە لە سەردەم و لە دەسەڵات بگرێ.

سەرهەڵدانی سیمفۆنیا

یاخیبوونێک دژی سانسۆرکردنی ئۆپێرا لەلایەن دەسەڵاتەوە

پاش سەرهەڵدانی ئۆپێرا، ژمارەیەکی زۆر لە ئاهەنگساز و مۆسیقارەکان پشتیان لە ئۆپێرا، ڕوویان کردە جۆرە مۆسیقایەکی تر: دامەزراندنی تیپی مۆسیقاییی سەربەخۆی ئۆرکسترایی، پاشانیش سیمفۆنیا.

وشەی سیمفۆنیا Symphony لە سینفۆنیاوە Sinfonia هاتووە کە دەکاتە Overture ئەو پێشەکییەی کە لەگەڵ پەردەکرانەوەدا بۆ بەرهەمێکی مۆسیقایی (ئۆپێرا) پێشکێش دەکرێت. سەمفۆنیای ئۆرکسترالّی، واتە: بەرهەمێکی ئاوازخوێن بۆ ئۆرکسترا بەڵام بەبێ وشە.

پێشەکیی ئۆپێرا، بەم شێوەیە بوو بەبناغە و یەکەمین مۆدێلی سیمفۆنیای ئۆرکسترایی.

ئەنتۆنیۆ ڤیڤالّدی (١٦٧٥- ١٧٤٣) یەکێک لە یەکەمین ئاهەنگسازەکانی ئەو قۆناغە بوو کە لە شاری ڤینیز لە ئیتاڵیا دەژیا و سەمفۆنیای (چوار وەرزەکە) هی ئەوە؛ ڕۆڵێکی گرینگی هەبوو لە هێنانە ئارای سۆلۆ (تاکژەنی - تاکنەوازی) بۆ ناو کۆنسێرت.

بەم شێوەیە وردە وردە دەربڕینی بیر، بەیانکردنی ئەندێشەی تاکەکەسییانە لە ڕێگەی مۆسیقاوە، لە ناو هونەری مۆسیقادا دەستی پێ کرد؛ کە دەیویست مرۆڤ و ڕووخساری مرۆڤ لە ناو مۆسیقادا پێشان بدا.

ئەگەر داهێنانی ئۆپێرا یاخیبوونێک بێت دژی دەسەڵاتی کڵێسا، ئەوا گەشەسەندنی مۆسیقا لە کۆتاییی سەرەتای سەی هەژدەمدا وەک یاخیبوونێک دژی سانسۆری ئۆپێرا لەلایەن دەسەڵاتەوە دێتە هەژمار.

دوای ڤیڤالّدی، یۆهان سێباستیەن باخ (١٦٨٥- ١٧٥٠) لە ئەڵمانیا گەورەترین ئاهەنگسازەکانی ئەو سەردەمەیە. سەر بە کڵێسای مارتن لووتەری (پرۆتێستانت) بوو، بەڵام لە دوڕیانی مۆسیقای کۆن و مۆسیقای نوێدا، ڕێگە نوێیەکەی هەڵبژارد. جگە لەمەش تەنزیراتەکانی و ڕۆڵی لە بواری

پەروەردەی مۆسیقاییدا لە بیر ناکرێ. لە ناو مۆسیقای ئەودا سەرەتاکانی بیری نەتەوەییی ئەڵمانی، لە ڕێگەی دەربڕینی بیری لووتەرییەوە هەستی پێ دەکرێ. مۆسیقای ئەو ڕۆحی پەرێشانی ئەڵمانیای سەردەمی دوای مارتین لووتەر بەیان دەکا.

ئەو کەڵەمۆسیقارەی کە هات دڕی بە نەریتە کۆنەکانی مۆسیقا دا، فرانتس ژۆزێف هایدن (١٧٣٢– ١٨٠٩) بوو. لە بەستێنی بەرەو پێشەوەبردنی فۆرمی مۆسیقایی کە لەسەر بنچینەی جووڵەی هارمۆنیک دامەزرابێت لە هەموویان چالاکتر بوو: هایدن حسێبێکی زۆری دەکرد بۆ دینامیکیەتی مۆیسیقا و لە یەکتر جودابوونی ڕیتمەکان. بەم شێوەیە، لای هایدن، میلۆدی، دەسەڵاتی لە ناو فۆرمی مۆسیقاییدا پەیدا کرد: هارمۆنیەتە جێگۆڕبووەکان توانییان سۆزی مرۆڤایەتییانە دەرببڕن.

هایدن پێوەندییەکی زۆری بە ژیانی جووتیارەکانەوە هەبوو، میلۆدی و ئیقاعی ژیانی جووتیارانی خستە ناو مۆسیقاوە. بۆیە لەلایەن دەسەڵات و دەرەبەگەکانەوە تۆمەتبار کرا بەوەی کە ئەو «هونەری جیدی و هونەری کۆمیدی تێکەڵاوی یەکتر دەکات».

هونەرمەندی نەمساویی شاری سالزبۆرگ، ولْفگانگ ئامادیۆس مۆزارت (١٧٥٦– ١٧٩١)، هاوچاخی هایدن، لەوانەیە چالاکترین ئاهەنگسازەکانی ئەو سەردەمە بێت کە لەگەڵ هایدن هامۆشۆیان هەبوو و بەرهەمەکانی یەکتریشیان خۆش دەویست.

مۆزارت دەرفەتی نەدەدایە گوێگر هەناسە بدات: هەرکە پێشبینییەکی مۆسیقایی بیسەری ڕادەکێشا، پێشبینییەکی مۆسیقاییی تر دڵی دەخستە جونبوشەوە. هیچ مۆسیقارێکی تری پێش مۆزارت نەیتوانیبوو بە کەمترین ماوە ئەو هەموو کاریگەرییە زۆرە بەسەر گوێگردا جێ بهێڵێ.

مۆزارت لەو ئۆپێرایانەی لە ١٠ ساڵی کۆتاییی ژیانیدا نووسینی، کانگای بیری خۆی دژی ئەو چوارچێوە دەسەڵاتدارییە ناشیرینە دەربڕی کە لە

سەردەمی ئەودا تەنگی بە مرۆڤ هەڵچنیبوو. ماوەیەکیش ڕووی کردە سازدانی ئۆپێرای کۆمیدی بۆ ئەوەی خەڵک بەرامبەر دەسەڵات بەپێکەنین بهێنێ. (ڕاکردن لە حەرەمسەرا) کۆمیدیایەکی ڕۆمانسییە ژیانی گەندەڵی ناو تەلاری سوڵتان و پاشاکان تاوتوێ دەکا. پاشانیش لە ١٧٨٤ ئۆپێرای (ژنهێنانی فیگارۆ)ی نووسی کە بووە بنچینەیەک بۆ کۆمیدیای ریالیستی و لەلایەن دەسەڵاتەوە تووشی هەڕەشە و سانسۆر هات.

مۆزارت، لە زۆربەی بەرهەمەکانی خۆیدا ناچار بووە پەنا بۆ سیمبۆل و ڕێبازی سیمبۆلیزم ببات بۆ دەربڕینی «ڕستە مۆسیقاییەکانی».

لۆدویک ڤۆن بتهۆڤن (بۆن ١٧٧٠– ڤیەننا ١٨٢٧) نۆزدە ساڵان بوو کە شۆڕش لە فەرەنسا بەرپا بوو. سەیرە: شۆڕش لە فەرەنسا بەرپا بوو کەچی لە شاری ڤیەننا لای بتهۆڤن خۆی دەربڕی!

قۆناغی یەکەمی بتهۆڤن گەڕان بوو بەدوای دروستکردنی کەسایەتیی مۆسیقای خۆی. لە١٧٩٥/٢/٢٠ بتهۆڤن، شۆرەتی پەیدا کردووە و لە ڤیەننا یەکەم بەرهەمی خۆی پێشکێش دەکا. لە (١٨٠٠) بتهۆڤن کەڕ دەبێ؛ قۆناغی دووەم (١٨٠٢– ١٨١٤) جیهانبینییەکی لە بنەڕەتەوە نوێیە. لەم قۆناغەدایە کە سیمفۆنیای دووەمی خۆی بە ناوی (ئێرۆییک: قارەمان) دەیەوێ پێشکێش بە ناپلیۆن بکا، بەڵام دواتر کاتێ دەزانێ ناپلیۆن لەڕێگەی ئازادیخوازیی خۆی لادەدات و وڵاتان داگیر دەکا، پەشیمان دەبێتەوە. ئنجا سیمفۆنیای هەشتەم دەنووسێ. لە ١٨٠٩/٥/١٢: ناپلیۆن ڤیەننا داگیر دەکا، ئەو کاتە بتهۆڤن لەوێ دەژیا، بتهۆڤن کە جاران ناپلیۆنی بە ئازادیخواز و پاڵەوانی ئازادی دەزانی، ڕقی لە ناپلیۆن هەڵدەستێ و نەفرەتی لێ دەکا. هاوڕێیەکی بتهۆڤن بەناوی (بریتانۆ) لە ١٨١٢دا دەڵێ: «هیچ پاشایەک بەقەد بتهۆڤن هەستی بە هێز و دەسەڵات نەکردووە»؛ واتە خۆی مەزنتر لە هەر دەسەڵاتدارێک دیوە.

سیمفۆنیای پێنجەمی بتهۆڤن: «قەدەر»، سیمفۆنیای چوارەمی، ناوی: «ئەوین» بوو.

پێشکێشکردنی سیمفۆنیا بۆ هەموو خەڵک دەسپێشخەرییەکی کۆمەڵایەتی بوو. بتهۆڤن دەیویست بەڕاستی مۆسیقا بکاتە جەماوەری و بیباتە ناو گەل؛ بۆیە بەهرەی لە ئاوازە میللی و ناڵینە جەماوەرییەکان وەردەگرت. لە سیمفۆنیای سێیەمدا مارشی ماتەمینێکی جەماوەریمان گوێ لێ دەبێ. سیمفۆنیای سێیەم و چوارەم لێوانلێون لە مۆسیقای نەتەوە. سیمفۆنیای پێنجەم سروود و مارشەکان تێیدا ڕەنگیان داوەتەوە. لەخۆڕا و بێ بەڵگەش نییە کە ناویان لە سیمفۆنیای هەفتەم ناوە «سیمفۆنیای سەماکان».

قۆناغی سێیەمی بتهۆڤن لە ساڵی ١٨١٤ دەست پێ دەکا، کە هیچ نانووسێ تا مردنی: تەنیا سیمفۆنیای نۆیەم نەبێ.

لە ١٨١٥- ١٨٢٤ بتهۆڤن سەمفۆنیای نۆیەم دەنووسێ و لە ساڵی ١٨٢٤ پێشکێشی دەکا. ڤاگنەر دەڵێ «خوا دنیای خەڵق کرد بۆ ئەوەی بیتهۆڤن سەمفۆنیای نۆیەم بنووسێ».

گوێنەدانی تاک بە کۆمەڵ تیمێکی دیاری مۆسیقای بتهۆڤنە. ئەمەش لەسەر بنچینەی باوەڕی بتهۆڤن بە ریالیزم: چونکە ئەو، گرفت و داخوازییەکانی مرۆڤی سەردەمی، بەشێوەیەکی جەسوور و چاونەترسانە دەردەبڕی. ریالیزمی بتهۆڤن دەربڕینی دەنگەکانی باڵندە و هەور و مەل و کانیاو نییە بەڵکو بریتییە لە دەربڕینی ڕووخساری مرۆڤ و کۆمەڵگەکەی خۆی، جەسوورانە، لە ڕێگەی دەنگە هاوچەرخەکانی ڕۆژگاری خۆی.

دراما، یان درامیبوونی مۆسیقایی، لای بتهۆڤن خاڵێکی تری هەڵبوێردراوە. ریالیزمی بتهۆڤن لەمەشەوە دێ کە ناوبراو کاری تەنیاوتەنیا لەسەر جووڵە و دراما و ململانێ و تێکۆشان و جەنگ و شیتەڵکردنەوەی تراجیدیای ژیانی نوێ کردووە. لە ناو بەرهەمەکانی ناوبراودا زیهنێکی گەورە تەماشای ژیانی سەردەمی خۆی کردووە تا بتوانێ ئەو مۆسیقایە بەرهەم بهێنێ.

مۆسیقای بتهۆڤن هەمیشە بەناو یەک زنجیرە ڕووبەڕووبوونەوەی درامیدا تێ دەپەڕێ. تیمێک یان نیوەڕستەیەکی مۆسیقایی، هەمیشە، بە تیم و

نیـوەڕسـتـەیەکـی مـۆسـیـقـاییی دژی خـۆی وەڵامـی دەدرێـتـەوە. ڕێـڕەوێک لە نـاو ڕیتمێکدا وەڵامی ڕێڕەوێکی تری ناو ڕیتمێکی تر دەکاتەوە.

مـۆسـیـقـای بتـهـۆڤن، پۆلیـفـۆنیک (چەند دەنگ)، عـەینەن خـۆپیـشـاندانێکی مـۆسـیـقـایی و شـاعیـرانە؛ هەر دەنگێک – هـارمـۆنیـانە – دەزانـێ چ وەخـتـێک نـاڕەزاییی خـۆی دەربـبـڕێت و کـەی ئـارام ببـێـتــەوە بۆ ئەوەی دەرفـەت بداتە دەنگێکی شـاعـیـرانەی تر تـا یاخـیـبـوونی خـۆی بـخـاتە نـاو خـۆپـێـشـاندانە مۆسیقاییە درامییەکەوە.

مـۆسـیـقـای بتـهـۆڤن تەنیـا هـەسـتی گـوێگرەکـان دەرنـابڕێت بەڵکو لە ڕێگەی بیـرکردنـەوەی ئـاهـەنگسـازەوە ئەو هـەسـتـانـەی گـوێـگریش وێرانیش دەکـات و ڕەهەندێکی مێژوویی و ئیستێتیک دەبەخشێتە هەستەکانیان.

گـوێگر دەپرسـێ: چ ملمـلانێیـەکی کـۆمـەڵایەتی، چ زۆرانبـازییـەکی تـاک دژی ڕەمـزەکـانـی دەسـەڵات، یان چ نـاهـەمـواری و کـێـشـەگـەلێکی هـاوچـەرخ بوونەتە هـۆی سـەرهـەڵدانی ئەم هـەمـوو دەنگە دانسـقـە و میلۆدییە تازانە لای بتـهـۆڤن؟ ئەمەیە ریالیزمی بتهۆڤن: وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە گرینگەی کردمان.

فـرانـتس شـووبێـرت (١٧٩٧– ١٨٢٨) لە ڤیـەننا کـاتێ دەسـتی بەکـارکـردن کرد، خەڵک بتـهـۆڤنیان وەک بت دەپەرست. بەڵام لەگەڵ ئەمـە، ئەویش، فرانتس شــووبێـرت، ڕۆڵـێکی باشی بیـنی لە برەودان بە مـۆسـیـقـای سـەردەمی خـۆی: بەڵام زیاتر بەشـێـوەیەکی ڕۆمـانسـیـیـانە. شیـعـری شـاعیـرە ڕۆمـانسـییـەکـانی ئەڵمانیای خستە ناو ئاهـەنگە مۆسیقاییەکانەوە کە بە دەوری ئازادیی مرۆڤ و چێژوەرگرتن لە ژیان دەسووڕانەوە.

مـۆسـیـقـاژەنێکی ڕۆمـانسـیی تریـش، لە هـەمـان سـەردەم، فرێدریک شـووپـان (١٨١٠– ١٨٤٩) هـەبوو. فــرێدریک شــووپـان، کــە مــاوەیەکـی زۆر هـاوڕێ و دۆسـتی خــانمە نووســەری فــەرەنسی جـۆرج صــانـد بوو، بەهرەی لـە هـەمـان بابەتەکانی شووبێرت و لە مۆسیقای ناوچەییی پۆڵۆنیاوە وەردەگرت لە پێناو ئازادکردنی وڵاتەکەی خۆی: پۆڵۆنیا، ئەو پۆڵۆنیا داگیرکراوەی کە لە قووڵاییی

برینی پڕ لە نسکۆی سۆز و هەستەکانی ژێردەستەییی خۆیەوە، ناڵە و نرکەی، دەگەیشتە ناو دەنگی پیانۆکەی شووپان.

هیکتۆر بێرلیۆز (١٨٠٣– ١٨٦٩) مۆسیقاژەنی شۆڕشگێڕی فەرەنسا، «لە شکسپیر و گۆتێ و بتهۆڤن زیاتر هیچ کەسی تری بە هونەرمەند نەدەزانی»، دژی هەموو کلێشەیەکی کۆن و فۆرمێکی باو بوو. وا دەژیا وەک بلێی دەوراندەوری بە گورگ تەنرابێت؛ ئەویش، بە گوڕ و تینێکی تازەوە هاتە ناو دنیای مۆسیقای ریالیست.

مۆسیقاژەنی ئەڵمان، ڕیچارد ڤاگنەر (١٨١٣– ١٨٨٣) لە ماوەی سالانی جەنگی ناو شەقامەکاندا (١٨٤٩) لە شاری دریسیدن لە ئەڵمانیا ناچار کرا ئەڵمانیا جێ بهێڵێت و ڕابکاتە فرەنسا.

ڤاگنەر، کە هەندێک پێی دەڵێن «بلیمەتی شووم» دەیویست هەرچی شتێک کە پێشتر لە مۆسیقاوە پێی گەیشتبوو، هەموویان تێک بشکێنێت و مۆسیقایەکی تازە دروست بکات؛ دەیگوت: «مۆسیقا دەبێ لە پێناو گەیشتنە ئامانجێک بێت».

لای ڤاگنەر ئۆپێراکان درێژتر، ئۆرکستراکان دوو هێندە درێژتر لە چاو ئۆرکسترای ئاسایی بوون: چڕین بەدەنگێکی زۆر بڵندتر، دیمەنەکانیش شکۆمەندتر. هەموو ئەمانە هەترەشی گوێگریان دەبرد، دەیانخستە دۆخێکی نامۆی پڕ لە ورووژانەوە. بۆیە لەم بارەوە ئەندرۆ بۆوی A. Bowie (زیباشناسی و ذهنیت، مترجم: فریبرز مجیدی، انتشارات فرهنگستان هنر، تهران: ١٣٦٨) دەڵێ: جوانیناسیی کلاسیک ئەگەر جوانیناسییەکی

هاوئاهەنگی بێت: ئەوا لای (ڤاگنەر) هاوئاهەنگی نییە، بەڵکو تێکچڕژاوییە.

مۆسیقای ڤاگنەر، بەبێ ئەوەی هاوئاهەنگیی نێوان دەرەوە و ناوە فەرامۆش بکات، لە جیاتی ئەوەی قسە لەگەڵ گوێگر لەبارەی ژیانەوە بکات، خودی ژیان خۆی دەهێنێتە ناو مۆسیقا و بەردەم گوێگر. لەم بارەوە، نیتشە دەڵێ:"

«ڤـاگنەر زمـان دەخـاتە حـاڵەتگەلێکی ئەوتـۆ کـە تۆ ناتوانیت بیـر لە هـیچ ئاستێکی مانابییان بکەیتەوە».

خـاڵێکی تری دیاری ڤاگنەر بریتی بوو لـە دەربڕینی لایەنـە نالۆجـیکەکـانی زیهن. ئـەم دیاردەیەی لە ڕێگەی ئـەو تێـمانـەوە وەدی دەهێنا کـە لە بەریەکـتـر کەوتنی نێـوان تاک و ڕووداوەکـانی سـەر شـانۆوە دروست دەبوون، ئەمـەش لە شـێوەی ئەو ڕەمـز و ئـاوازانەی کە جێگەی خـۆیان بـۆ ڕەمـز و ئاوازی تر چۆڵ دەکرد.

سیـدنی فینکلشـتاین (بیان انـدیشه در موسـیقی، ت: محـمد تقی فـرامرزی، نگاه، تـهـران: ١٣٨١) دەڵێ: «مـۆسـیقـای ڤـاگنەر جـۆرێک لە وەحشـیگەرایی مـۆدێرن بوو». چونـکە هونەرمـەند کـاتێ ئـەو هـەمـوو پاڵەپەسـتـۆیـانەی کـۆمـەڵی بۆرژوا دەرژێتـە ناخـیەوە، چەندان ڕەمـز و دۆخـی سـەرەتایی و وەحشـیگەرا لە ناو کانگایدا ڕەگاژۆ دەبن.

ڕووداوەکان لای ڤاگنەر ئەنجامی ئەو هەموو کارەسات و نەفرەت و هێزانەن کە بەهۆی قـەدەری مـرۆڤـەوە ڕووبەڕووی مـرۆڤ بوونـەتەوە؛ بەڵام مـرۆڤ لە ناو هەموو ئـەم دنیا پڕ لە مـەترسییـەدا، دەستـەویەخەی مـردنەکان و هەڕەشـەکان، ئیرادە بەکار دێنێت و ڕووبەڕووی قەدەری خۆی دەبێتەوە.

فەیلەسووفی ئەڵمان، فرێدریک نیتشە زۆر حەزی لە مۆسیقای ڤاگنەر بوو

چونکە مـۆسـیـقـای ڤـاگنەر «وانەیـەکی فـەلسـەفـیـیـانـەی فـەلسـەفـەکـەی شۆپنهاوەر» بوو بۆ ئەو.

١٨٤٥: ڕیتشارد ڤاگنەر (١٨١٣– ١٨٨٣) یەکەمین سەمفۆنیاکانی دادەڕێژێ.

١٨٥١: ڤاگنەر (١٨١٣– ١٨٨٣) تەنزیرات لەبارەی هونەری موزیک و ئۆپێرا و دراما؛ کتێبی (ئۆپێرا و دراما).

١٨٦٥: ڤاگنەر: سەمفۆنیای (تریستان و ئیزۆلد).

١٨٧٤: هـاوزەمـانی پێشـانگەی ئیـمپرێسیـۆنیستـەکان، ڤاگنەر سەمـفـۆنیـای (خواوەندەکان) دەژەنێ.

لای ڤـاگنەر، پاشـانیش بەهـەمـان شـێـوە لای یۆهانس بـرامس (١٨٣٣– ١٨٩٧) باسکردنی ڕووداوە سـیـاسـیـیـەکـان و دەربڕینی جـمـوجـۆڵە جـەماوەرییـەکان تەرجـەمـە کرانە سـەر زمـانی مـۆسـیقـا،؛ چونکە باسکردنی ڕووداوە سیاسی و جـەماوەرییەکان لای ئەم دوو مـۆسـیقاژەنـە، بریتی بوو لە ڕووبەڕووبوونەوەی کـۆمـەڵێک مـەسـەلەی مـۆسـیـقـاییی تازە، کـە پێشـتـر هیچ مۆسـیقارێک نەیتـوانیبوو ئەم کـارە بەهـەمان سەلیقە و شێوازی ئەوان ئەنجام بدات.

بەم شـێـوەیە، مـۆسـیـقـای ریالیـزم، لـە کـۆتاییی سـەدەی نـۆزدەم بەمـلاوە سەرکەوت و ئاڵایـەکەی درایە دەست مۆسیـقارە گەنجەکانی سـەرەتای سەدەی بیستەمەوە.

ئۆپێـرا ناودارەکانی ئاهەنگسـازی ئیـتـاڵی (جـواکینـۆ ئەنتـۆنیـۆ ڕووسـینی (١٧٩٢– ١٨٦٨) ڕۆڵی زۆریـان هـەبوو لـە بەرەو پێـشـەوەبردنی مـۆسـیـقـای ریالیست.

ئنـجـا ئـاهـەنگسـازێکی تری ئیـتـاڵی، ژۆزێـپـێ ڤـێـردی (١٨١٣– ١٩٠١) ئۆپێـرای گەیاندە لووتکەی ریالیزم. ئەمـە جگە لە دەرکـەوتنی کـەمـانچـەژەنی ئیتـاڵی، پاگانینی Paganini (١٧٨٢– ١٨٤٠) کـە لە کـەمـانچـەژەنیدا هێند بێ هاوتا بوو ناویان لێ نابوو (ئەهریمەنی کەمان).

پاپا، لویسی دوازدەم، بەپێی فرمانێک کە لە ڕۆما لە ماوەی سالآنی ١٨٤٠– ١٨٤٩ پیادە دەکرا ئەمری دابوو: (هـەر ئـەکـتـەر و مـۆسـیـقـار و هونەرمـەندێک ئەگـەر بە وشـەیەک و جـووڵەیـەکی ناقـۆلاش لە تێکسـتـە سـانسـۆرکـراوەکـەی پێـشـتـر ڕەزامـەندیی لەسـەر دراوە لابدات، پێـنج سـاڵ زیندان دەکـرێ. هـەر کـەسێکیش چەپڵـە بۆ ئەم دەرچوون لە تێکسـتـە لێ بدات ئـەوا ئەویش دوو تا پێنج مانگ حـەپس دەکرێ). بۆیە ژۆزێپپێ ڤێردی ناچار بوو کە مەبەسـتـەکانی خۆی تەنیا بە زمانی نواندن و ڕەمز و میلۆدی دەرببڕێت، هـەموو ئەم نواندن و ڕەمز و میلۆدییانەش ڕەهـەندی کۆمەلایەتییان هـەبوو.

دوای ئەمانیش، لە ڕووسیا، گرووپێکی مۆسیقاژەن بەناوی گرووپی (پێنج کەسی) سەریان هەڵدا. پاشانیش پیتەر چایکۆفسکی (١٨٤٠– ١٨٩٣)، ئەویش هەر لە ڕووسیا، مۆسیقای ریالیستیان جوانتر و ڕەنگینتر کرد. کار گەیشتە ئەوەی کە لە ناو هەموو ئەم مۆسیقاژەنە ریالیستانەوە، چەندان ئاهەنگسازی مۆدێرنی وەک ئارنۆڵد شوونبێرگ (١٨٧٤– ١٩٥١) و سیبلیۆس (١٨٦٥– ١٩٥٧) لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا سەرهەڵبدەن.



گرووپێکی ئەرمەنی لە ئەستەمبۆڵ لە سەرەتای سەردەی بیستەمدا

# سەرچاوەکان

به فەرەنسی:

Musique dans Le monde francois- Rene Tranchefort: Les ins truments , Ed. .seuil, paris:1980 P. 159, 160, 100. Volume .

B. NIKITINE: Les Kurdes, ed. Maspero, Paris, P. 150-175.

Joyce de WANGEN- BLAU: Les Juifs du Kurdistan, in Bulletin de L Association Des Anciens Eleves,INALCI, Paris: Fevrier 1986. P. 20 - 28.

Thomas BOIS: Les Dominicains a l avant-garde de la Kurdologie au XVIIIe Siecle, Hivum fartrum pracdicaticarum, XXXV, Paris: 1965, P. 267-275.

L Iran des mages et du temps present, Extrait du Numero de Noel 1961,"C.F.P. Information". Paris:1961. PP.3-4.

Xenophon: Anabase , tome ll, Livre lV- Vll, Texte etabli et traduitr psar Paul Masqueray, ed. Societe d. edition (Les Belles Lettres), Paris :1967.p.18.

Gramaire kurde par Ali Teramakhi offert a l Academie Imperial des Sciences a St-Petersbourg, par A.JABA.

Vocabulaire kurde des dialectes de Hekari et Revendi, par A. JABA, Consul de Russie q Erzeroum, Erzeroum le 15 Mars 1858.

Alain Bosquet: Entretiens avec Yashar Kemal, Gallimard, Paris: 1992.

Emile Vuillermoz: Histoire de la musique, Fayard, Paris: 1949.

Jean During: Zekr et chantes des dervichs Qaderi du Kurdistan, in (Jean During, Musique et mystique dans les traditions de l Iran), Teheran- Paris, Leuven, Ed. Peters, 1989, P. 239- 290.

Jean During: La tradition musicale esoterique des Ahl-E- Haqq, in (Jean During, Musique et mystique dans les traditions de l Iran), Teheran-Paris, Leuven, Ed. Peters, 1989, P. 293- 520.

Andre Clot: Ziryab un Kurde Celebre, in Les Kurdes dans l actualite, Pub. de l Institut Kurde de Bruxelle, Bruxelle: 2003, P. 16-17.

Notice sur les manuscripts Syriaques et arabes de l Archeveque Chaledeen de Diarbekir, in (Journal Asiatique, Sept.-Oct. 1907, P. 409).

Catalogue des maunscrits Syriaques et arabes et arabes consacrea dans la Bibliotheque episcopale de Seert, avec notes bibliographiques, Moussul: 1905, N. 128-2.

Addai SCHER: Histoire Nestorien, Chronique de Seert, Archeveque Chaldeen de Kurdistan, Paris: Juin: 1909.

به ئینگلیزی:

The Cambridge history of Iran.V.2. The Medien and Achamenian Period, ed. by ILya GESCHVITCH, Cambridge university Presse, London_ Newyork_ Sydney: 1968?,P354, 365_359.

Henri Prunieres: A new History of Music, N. Y. 1943.

Hector Berlioz: Memoires, N. Y. 1932.

: Our Musical Hertiage, N.Y. 1948 Curt Saches

: The Commonwealth of Art, N.Y. 1946. Curt Saches

به فارسی:

اندرو بووی A. Bowie : زیباشناسی و ذهنیت، مترجم: فریبرز مجیدی، انتشارات فرهنگستان هنر، تهران: ١٣٦٨

سیدنی فینکلشتاین: بیان اندیشه در موسیقی، ت: مخمد تقی فرامرزی، نگاه، تهران: ١٣٨١.

– کردستان مهد تمدن موسیقی در کردستان، ڕۆژنامەی (ندای جامعه)، یک شنبه ٢٠ مرداد ماه ١٣٨٧، شماره (١٧٥) و (١٧٦)، کرمانشاه.

مهندس جلال الدين اشتيانى: زرتشت، مزديسنا و حكومت، شركت سهامى انتشار، چاپ سوم، تهران: ١٣٦١ش.

نور على برومند: رديف سازى موسيقى سنتى ايران، رديف تار و سەتار، مقدمه و نت نويسى: ژان دورينگ، انتشارات سروش، چاپ اول، تهران ١٣٧٠ش.

حبيب الله صمدى : كردستان در چهل هزار سال پيش، مجلهء (بغستان) جلد اول، شمارهء اول، ص ٣٨-٣٩. تهران : ١٩٦٣.

محمد تقى جعفرى: تاريخچەى موسيقى ايران، نشر هستان، چاپ دوم، تهران ١٣٧٨ش.

روح انگيز راهگانى: تاريخ موسيقى ايران، انتشاراتى پيشرو، چاپ اول، تهران ١٣٧٧ش.

هنرى جورج فارمر: تاريخ موسيقى خاورزمين، ترجمەى بهزاد باشى، موسسەى، انتشارات آگاه، چاپ اول، زمستان ١٣٦٦ش.

دكتر مهدى فروغ: نفوذ علمى وعملى موسيقى ايران در كشورهاى ديگر، انتشارات ادارەى كل نگارش وزارت فرهنگ وهنر، چاپ اول، تهران ١٣٥٤ش.

ماشا الله سورى: سرودهاى دينى يارسان، ترجمة، مُوسسةي انتشارات اميركبير، چاپخانەى بانک بازرگانى ايران، چاپ اول ١٣٤٤ى ش.

سيد محمد سيف زاده: پيشينەى تاريخى موسيقى لرستان، انتشارات افلاک، چاپ اول ١٣٧٧ش.

بە عەرەبى:

د. شهرزاد قاسم حسن: الات الموسيقي التقليدية في العراق المعاصر. بغداد ١٩٧٦م.

د. فائزة محمد عزت: الحياة الاجتماعية للكورد بين القرنين (١٠- ١٥م)، منشورات الاكاديمية الكردية، اربيل: ٢٠٠٩

ابراهيم هاشم محمد الرجب: الموسيقيون والمغنون خلال الفترة المظلمة، بغداد: ١٩٨٢، ص ٢٦

البيهقى: المحاسن و المساوى (١٠٧٧ م)، دار صادر، بيروت: ١٩٧٠

الخوارزمى: مفاتيح العلوم (٩٩٧ م)، القاهره: ٢٠٠٤

ابن خلكان: وفيات العيان (١٢٨٢ م)، دار صادر، بيروت.
العسقلاني: الدرر الكامنة (١٤٤٨ م)، دار الجيل، بيروت: ١٩٩٣، ص ١٦٤ و ٣٥٥.
الفارقي: تاريخ الفارقي (١١٨١ م)، دارالكتب اللبناني، بيروت: ١٩٧٤، ص ١٧ و ١٢٢ و ١٧٠
ابوالفداء: مختصر كتاب البلدان (١٣٣١ م)، دار احياء التراث العربي، بيروت: ١٩٨٨، ص ١٧٨
المسعودي: مروج الذهب (١٠٣٠ م)، بيروت: ١٩٧٣، ص ٢٢١.
ابن خلدون: المقدمة (١٤٠٥)، دار العودة، بيروت: ١٩٨١
القزويني: اثار البلاد، دار صادر، بيروت: ١٩٦٠
المقريزي: المقفي الكبير (١٤٤١ م)، دار الغرب الاسلامي، بيروت: ١٩٩١، ص ١٠٥
ابن الشعار الموصلي: قلائد الجمان (١٢٥٦ م)، دار الكتب، موصل: ١٩٩٢
الحنبلي: شفا القلوب (١٤١٧ م)، دار الحرية، بغداد: ١٩٧٨، ص ٣٨١
الحنبلي: شذرات الذهب (١٤١٧ م)
المستوفي: تاريخ اربل، ق ١، ص ١١٦، ٢٦٤
ابن كثير: البداية والنهاية (١٣٧٢ م)، دارالكتب العلمية، بيروت: ١٩٨٧، ص ٩٣
ابن العديم: بغية الطلب في تاريخ حلب (١٢٦٢ م)، دارالفكر، بيروت، ص ٩٨٣
النعيمي: الدارس في تاريخ المدارس (١٥٢٠ م)، دارالكتب العلمية، بيروت: ١٩٩٠، ص ١٥٧
– احمد بن يوسف الارزق الفارقى: تاريخ الفارقى، تحقيق و تقديم: د. بدوى عوض، القاهره: ١٩٥٩

به كوردی:
حەمەی حەمەباقی: مێژووی موزیک لە کوردستاندا، دەزگای ئاراس، هەولێر.
نەجاتی عەبدوڵا: چەند باسێک لەبارەی ئەهلی هەق، دەزگای موکریانی، هەولێر: ٢٠٠٥.
ئەولیا چەلەبی: سیاحەتنامە، کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا، وەرگێڕانی: سەعید ناکام، لە بڵاوکراوەکانی ک. ز. ک.، بەغدا: ١٩٧٩.

باکووری: ئێزگە، چاپخانەی شەهاب، هەولێر: ٢٠٠٩
عەبدولڕەقیب یووسف: تابلۆکانی شەرەفنامە، بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی دووەم، هەولێر – ١٩٩٨.
– کەمال ڕەئووف محەمەد: یەکەم گۆرانیبێژی سەر قەوان کێیە؟، کوردستانی نوێ، ژمارە (١٢٧٢)، ڕۆژی ١٩٩٦/٤/٢٥
– محەمەد بایراقدار: ئیدریسی بەدلیسی، شکور مستەفا کردوویە بە کوردی، ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٩.
ئیبنو ئەرزەقی فارقی: مێژووی میافارقین و ئامەد، وەرگێڕانی: د. قادر محەمەد پشدەری و ئاکۆ بورهان، دەزگای وەرگێڕان، هەولێر: ٢٠٠٧.
– حەبیبوڵڵا تابانی: هاونەتەوەییی قەومی کورد و ماد. و: جەلیل گادانی، سلێمانی: ٢٠٠٨.